چاپی شەشەم

خالید تیرتوغرول

# ئەو ئافرەتەی



# لە دووی خۆی دەگەڕێت









ناوی کتێب: ئەو ئافرەتەی لە دووی خۆی دەگەڕێت

نووسەر: خالید ئێرتوغروڵ

وەرگێڕ: محمد خالید

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٢٧٨)ی ساڵی ٢٠١٠ ی پێ دراوە

# چیرۆکی ژیانێکی پڕ ئازار

چیرۆکی ژیانم کە بە مەرگی باوکم دەستی پێکرد نە ڕۆماننووس دەتوانێت بیخاتە سەر کاغەز و، نە دەرهێنەر دەتوانێت لە فیلمێکدا بیگێڕێتەوە. ئەم قسەیەم زیادەڕەوی نیە، بەڵکو ڕاستییەکی ڕووتە. قەت ئێوە دەستتان ناوەتە ئاگرەوە و هەستتان بە گەرمیە سووتێنەرەکەی کردووە؟ هەستتان بە ئازاری چەقۆ کردووە کە لە دڵتان هەڵچەقیبێت؟ هەرگیز بە قژ ڕاکێشراون و گاڵتەتان پێ کراوە؟

گەر وەڵامی ئەم پرسیارانەتان " بەڵێ " بێت، ئەوە لە من تێدەگەن. ئەوانەش کە دەڵێن " نەخێر " لە کاتی خوێندنەوەی بەسەرهاتی ژیانمدا تەنها دەتوانن لە دوورەوە هەست بە گڕەی ئاگرەکەی بکەن.

وەکو دەزانن هەندێك هەست و سۆز هەن ناتوانرێت باس بکرێن، بەڵکو دەبێت مرۆڤ خۆی ئەزموونیان بکات. منیش لەبەر ئەمە ژیانی خۆم لەم دێڕانەدا کورت دەکەمەوە. ئیتر نازانم بەم شێوەیە دەتوانم لە سەدا چەندی ئازارەکانم بهێنمە سەر زوبان.

نازانم لە کوێوە دەست بە گێڕانەوەی سەرگوزەشتەی ژیانم؟ بکەم ئەو تەمەنەی هەر لە بەهاریدا وەکو پووش و پەڵاش بەدەم بڵێسە و باوە سووتا. هەنووکە کاتێك دەمەوێت یادگاری و بیرەوەرییەکانی ژیانێکی پارچەپارچەبوو لەسەر کاغەز کۆبکەمەوە، دڵم دەگوشرێت و هەناسەم سوار دەبێت.

چۆن دەکرێت ئازار و ژان بکرێنە وشە؟ مێشکێکی ماندوو کاری وای لە دەست دێت؟

دیسانیش دەمەوێت بە خامەی ناکام و وشە لاوازەکانم دێڕەکانی ژیانم بنووسمەوە. هەرچەندە سەرلەنوێ برینەکانم دەکولێنەوە... ئەم

بەسـەرهاتە دەخەمـە سـەر کاغـەز تـا ئەوانـەی دوای خـۆم داو و تەڵـەکان بناسن و، ئاگایان لەو دوژمنانـە بێـت کـە وەك دۆسـت خۆیـان دەنـوێنن و، بازرگانانی چڵێس بناسـنەوە کـە تـەماحیان کردۆتـە جەسـتەی ئافرەتـانی زەبوون و دەیانەوێت پارەیان پێوە پەیـدا بکـەن. هـەموو ئـەو ڕووداوانـەی ژیانم دەخەمە پێش چاوان بۆئەوەی کەس چاو لە من نەکات..

بۆ ئـەم مەبەسـتەش پێویسـتە هـەموو نائومێدیـەکانم بنووسمـەوە تـا کچـانی لاو نەزانانـە نەکەونـە داوەوە. دەبێـت باسـی قـولاپی " هـاوڕێ و خۆشەویسـت " یـان بـۆ بکـەم. دەبێـت باسـی بەسـەرهاتی ئـەو ئەوینـە درۆیینانـەیان بـۆ بگێڕمـەوە کـە خراونەتـە ژێرپـێ. پێویسـتە ئاگاداریـان بکەمەوە کە ژیانی بەرەڵایی دەگات بە چ پەشیمانی و شکانێك.

تەنها بۆ پەند، بەسەرهاتی ژیانم دەخەمە نێو ڕستەکانەوە...

نیلۆفەر

# بەشی یەکەم

## ئەو ڕووداوانەی بەسەر دایکمدا هاتن



دایکم لەم دیوار خۆی دەدا بەو دیواردا و هاوار و ناڵەی دڵانی پارچە پارچە دەکرد، لە ئازارێکدا بوو وەك ئەوەی کەسێك بە زیندوویی لە ئاگردا بسووتێت. مەحاڵ بوو دڵنەوایی دانەوە و هێورکردنەوەی. ئەوانەشی دەیانویست دڵی بدەنەوە کاتێك بەم حاڵەوە دەیانبینی لە دایکم خراپتر دەگریان و لە خۆیان دەدا.

لە ڕووخساری بە نینۆك شەقار شەقاربوویەوە خوێن دەتکا. خوێنەکە تێکەڵ بە گوڵی سەر جلە سوورەکانی دەبوو و چزەی لە دڵی من هەڵدەستاند. دەبێت هەر ئەمە بێت سووتان و بڵێسەی ڕاستەقینە. چونکە نەك تەنها دایکم بەڵکو هەموو ئەوانەی دەسووتاند کە شایەتحاڵی ئەو دیمەنە بوون.

کاتێك ئەم ڕووداوانە ڕوویان دەدا من تەنها شەش ساڵ بووم. لەوانەی ڕوویان دەدا تێنەدەگەیشتم. تەنها بیرم دێت کە دایکمم بەو حاڵەوە دەدی، دڵی منداڵیم پڕدەبوو لە خەمێك کە ناتوانم باسی بکەم. بەدرێژایی تەمەنم ئەو دیمەنەم لەبیرنەچووەوە.

سەرەتای هەموو ڕووداوەکان بە هاتنی سەربازێك بۆ ماڵمان و پێدانی کاغەزێك بە دایکم، دەستی پێکرد. دیاربوو هەواڵێکی زۆر ناخۆشی هێناوە.

چونکە هەر ئەوەندەی دایکم کاغەزەکەی خوێندەوە خۆی کوتا بە زەویدا و وەك منداڵێك نەزانێت چی دەکات، کەوتە کوتانی سنگ و ڕنینەوەی قژی. ئیتر دوای ئەوە قیامەت لە ماڵی ئێمەدا دەستی پێکرد.

کەس لە قسەی کەس تێ نەدەگەیشت و کەس بەتەواوی نەیدەزانی چی ڕوویداوە. کەسیش نەیدەتوانی دڵنەوایی دایکم بداتەوە. ژنان باوەشیان دەکرد بە یەکدا و دەگریان.

منیش کە تاقە منداڵی ماڵ بووم، دەترسام دایکم ئەوەندە لە خۆی بدات بمرێت، بۆیە هەر لەو ساتەوە دڵی بەستەزمانی منداڵیم بە ژان و ناسۆر ئاشنابوو. منداڵیی من ئاوا غەمگین دەستی پێکرد...

دنیای دایکم ڕووخابوو و، چرای ئومێدی کوژابووەوە و خەیاڵەکانی بووبوونە خۆڵەمێش. هەر لە سەرەتای ژیانمانەوە بەختەوەری و ئارامی پشتیان لێ هەڵکردین و ئازار و خەفەت بوون بە هاوڕێمان. بەجۆرێك نائومێدی یەخەی گرتین و نەیهێشت هەناسەیەکی ئاسوودە هەڵبمژین.

ئەو ڕۆژە، ئەو هەواڵەی سەربازەکە هێنای بوو بە برینێك لە جەستەی ژیانماندا و هەرگیز سارێژ نەبوو. زامێك بوو هەمیشە لە هەلێك دەگەڕا بکولێتەوە.

باوکم کە هیچ ڕۆژێك بێ باوەش کردنم و بۆن پێوەکردنم نەدەچووە دەرەوە، لە شەڕی قوبروس شەهید بووبوو. ئەو باوکەی هەردەم بە "جوانکیلەکەم" و "شیرینەکەم" و "تاقانەکەم" بانگی دەکردم. بەداخەوە شەهیدبوونی باوکم جگە لە بێچارەیی و ناڕەحەتی هیچی تری بۆ ئێمە نەهێنا. دەتوت هەموو کێشەکان لە بۆسەدا بوون و چاوەڕێی ئەو ڕۆژەیان کردووە.

ئیتر من و دایکم بە تەنیا دەژیاین. ژیانی گران و ڕۆژانی پڕ لە چەرمەسەری دانیان لێ جیڕدەکردینەوە و تەڵەیان بۆ نابووینەوە. لەو ساتەوە دیاربوو ڕۆژانی ئاینده چەند بەئازار دەبن.

## خۆشەویستی ئاوا نەبینرابوو:

پاش شەهیدبوونی باوکم، دایکم نەهاتەوە سەر خۆی. چەندەها مانگ بە برسێتی و تینوویێتی بە باوکمەوە دەیبرژکاند. لە خەم و خەفەتدا جەستەی پووکایەوە و بووە تەرمێکی زیندوو.

ڕۆژێك نەمدی دایکم چاوی تەڕ نەبێت. خۆشەویستی و سۆزی وا هەرگیز وێنەی نەبینرابوو. دەڵێن: " خۆشەویستی زۆر، دابڕان بەدوای خۆیدا دەهێنێت ". هەر وا بوو. لە هاوسەریی ئەم دووانەی کە شێتانە یەکتریان خۆش دەویست تەنها حەوت ساڵ تێپەڕی کرد.

لە ژنانی تر دەمبیست باوکم دایکمی چەند خۆش ویستووە. چونکە من منداڵ بووم و تەنها دەمتوانی هەستی پێبکەم. ژیریم پەیی پێ نەدەبرد. وەلێ قسەی دراوسێکان منیان تووشی سەرسووڕمان دەکرد.

دایکم بەیانیان وەك تازە بووکێك بە چاوی تەڕەوە باوکمی بەڕێ کردووە بۆ سەر کارەکەی و بە حەسرەتەوە تا ئێوارە چاوەڕێی هاتنەوەی کردووە. هەموو جارێکیش پێی وتووە: " ڕۆژێك تەمەنێکە بۆ من، زوو وەرەوە با زۆر چاوەڕوانت نەبم."

دۆستان و خزمان خۆزگەیان بە ژن و مێردێکی وا خواستووە و کەوتوونەتە سەر زاران. بەڵام بەداخەوە ئەوینی گەرموگوڕی دایکم و عەشقی پاکی باوکم لە پڕێکدا لە بەین چوو. چەندین جار گوێم لە دایکم بووە بە باوکمی دەوت: " تۆ نەبیت یەك ڕۆژ ناژیم ". ڕاستی وتووە. ئەمەی ئێستای کەی پێی دەوترێت ژیان؟! هەر ئەوەیە هەناسە دەدات، دەڵێی تەرمێکی زیندووە.

کاتێك باوکم بە مەبەستی سەربازی لە ماڵ دەرچووە، ئاگری جوودایی ناو دڵی دایکم هەواڵی ئەم ڕۆژە شوومانەی پێداوە. ئەو شەوە تا بەیانی فرمێسکی ڕشتووە. وەك بڵێی هەر لەو ساتەوەختەوە هەستی بە دابڕان کردووە. کاتێك باوکم لە دەرگا چووەتە دەر، پێی وتووە:" دەزانم، نایەیتەوە و من بێ کەس دەخەیت ".

دایکم کە بە بێ باوك و دایك گەورەبووبوو، دوای مەرگی باوکم گەڕایەوە سەر هەمان دۆخ. دووری باوکم ئەوەندە کاریگەری لەسەری هەبوو؛ بە هیچ جۆرێك خۆی بۆ کۆ نەدەکرایەوە. هەردەم لەبەر خۆیەوە لەگەڵ باوکمدا دەدوا و باسی حەسرەتی خۆی بۆ دەکرد و دەیویست بەوە کەمێك لە گڕی جوودایی دامرکێنێتەوە.

خۆشەویستی نێوان دایك و باوکم هەر لە منداڵییەوە سەری هەڵداوە.

جارێکیان ژنێکی پیری دراوسێمان بۆی باس کردم. وتی: " ڕۆڵە گیان، من گەیشتوومەتە ئەم تەمەنە ژن و مێردی وا ڕاستگۆ و وەفادارم بۆ یەکتر نەدیوە. چاوی پیس کاری لێ کردن، چاوی پیس! "

ئەوینی نێوان دایك و باوکم خۆشویستنی گۆشت و ئێسقان نەبوو، بەڵکو نهێنی خودایی و خۆشەویستی جاویدانی بوو.

## خۆشەویستییەك کە بوو بوویە داستانی سەر زمانەکان:

داستانی باوك و دایکم کە کەوتبووە سەر زاری خەڵك، بەم شێوەیە دەستی پێ کردبوو:

دایکم هەر بە منداڵی بێ دایك و باوك کەوتووە. تەنها پوورێك و خاڵێکی لە ژیاندا هەبووە. لەبەر ئەوەی باری تەندروستی خاڵی باش نەبووە، پووری گرتوویەتیە خۆی. لە گوندێکی بچووکدا گوزەران و دەستکەوتیان هەژارانە بووە.

پـووری بێوەژنێـك بـووە. تـەنها خـاوەنی خانوویـەکی بچـووکی قـوڕو باخچـەیەکی بچـووك و مانگایـەك بـووە، کـە لەبـەر نـەبوونی ئالیـك شـیری نەبووە. دار و نەداری پووریٚ ئەمە بووە. بـەڵام دراوسـێ و خـزم و خـوێش دەستگیرۆییان کردوون.

باوك و دایکم لـە قوتابخانـەی سـەرەتایی لـە یـەك پۆلـدا بـوون. وەکـو باسی دەکەن دایکم زۆر جوان بووە. دوای قۆناغی سەرەتایی دایکـم لەبـەر نەبوونی نەیتوانیوە بخوێنێت. بەڵام باوکم چووەتە ناوەنـدی و دواناوەنـدی و، لەو ماوەیەشدا هەر هەست و سۆزیان بۆ یەك درێـژەی هـەبووە. پـووری ئاگای لەم حاڵە بووە و بە دایکمی وتووە: " کچم، ئەگەر خـوا نووسـیبێتی ئیشەڵڵا هەر دەبێت ".

ئەو ماوەیە زۆر کەس هاتوونەتـە خـوازبێنی دایکـم. جـوانیی و شـۆخ و قەشەنگی دایەم ناوبانگی دەرکردووە و ماڵیان بووەتە خانی سەرەڕێ. خوا هـەزار جـار لـە مامۆسـتا عبـداللەی گونـد ڕازی بێـت کـە دایکمـی هەمیشـە پاراسـتووە و ئاگـاداری بـووە و نەیهێشـتووە بکەوێتـە هەڵـەوە. ئەمـەش بووەتە هـۆی پابەنـدبوونی دایکـم بـە دینداریـیـەوە و هەسـتیاریی بەرامبـەر پەرستشەکان.

باوکیشم لەو ساڵەدا کە دواناوەنـدی تـەواوکردووە، گەڕاوەتـەوە و ڕێـی ئیمانداری هەڵبژاردووە. بابەم کە جاروبار عارەقی خواردۆتەوە و جگـەرەی کێشـاوە و چـەند خوویـەکی خراپـی تـری هـەبووە، لەسـەر دەسـتی مامۆستایەکیدا تۆبەی کردووە و ژیانێکی ڕێکوپێکی هەڵبژاردووە. هەر لـەو ساڵانەشدا خووی داوەتە کتێب و خوێندنەوە. بۆیە لە ماڵمانـدا کتێبـی زۆر

هەبوون. لە سەروو هەموویانەوە قورئانی پیرۆز و جەوشەن[1] و پەیامەکانی نوور...

ئیتر هەموو شتێك ئەو ساڵە دەستی پێکرد، واتە ئەو ساڵەی باوکم دواناوەندی تەواوکردووە.

## ڕۆژە سەخت و دژوارەکان:

مەحمود ئاغا کە خاوەنی زەوی و زار بووە و بە دەوڵەمەندی و زۆرداری ناوی دەرکردووە، کوڕەکەی بەنیازی هێنانی دایکم بووە. چەند جارێك چوونەتە خوازبێنی بەڵام دایکم نەیویستووە. خێزانێك کە تا ئەو کاتە ئەوەی ویستوویانە بووە و لە هیچ شتێکدا وەڵامی نەخێریان نەدراوەتەوە، ئەمەیان کردبوە مەسەلەی نامووس و شەرەف.

باوکم لەو ساڵانەدا لاوێك بووە لە کۆتا پۆلی دواناوەندیدا. زۆر پەلەقاژەی کردووە ڕێگری بکات، بەڵام مەگەر دەکرێت کەسێك بەرامبەر زوڵم و زۆری مەحمود ئاغا بوەستێت؟ ماڵی باوکیشم لەبەر ئاغا نەیانوێراوە بچنە پێشەوە و بڵێن ئەم کچەتانمان دەوێت بۆ کوڕەکەمان. گەر شتێکی وایان بکردایە دەبوو خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی عەشرەتێك ئامادە بکردایە کە کوشتن و خوێن ڕشتنیان کردبووە خوو. تەنانەت بۆ چاوترساندنی ماڵی باپیرم ڕۆژێك داویانە بەسەریاندا و داریان بەسەر بەردەوە نەهێشتووە.

---

١- "جەوشەن" واتە ئەو زرێیەی کە لە جەنگدا لەسەر سنگەوە دەپۆشرێت. بەڵام لێرەدا مەبەست ئەو موناجاتە ڕەنگینەی پێغەمبەرە – درودی خوای لەسەر بێت – کە بە ڕیوایەتی " زەینولعابیدین " – خوای لێ ڕازی بێت – دەماودەم ڕیوایەت کراوە و، لالانەوە و موناجاتێکە بە سیفاتە مەزن و ناوە جوانەکانی خوای گەورە و، لە نێوان هەموو بڕگەیەکیدا ئەم دەستەواژەیە دووپات دەبێتەوە: (سبحانك لا إله إلا أنت الأمان الأمان أجرنا من النار.. خلصنا من النار.. نجنا من النار).

ئەو ئەشکەنجە و سووکایەتییەی بە خەیاڵدا نەیەت کردوویانە. بەجۆرێك لەبەرچاوی هەموو خەڵکیدا ئەوەندە لە باپیرم و نەنکم (دایکی باوکم) و پوورم و مامیان داوە تا بووراونەتەوە. چونکە باوکم لە قوتابخانە بووە، لەو هێرشە ڕزگاری بووە. دوای چەند ڕۆژێك هەمان چارەنووس تووشی ئەویش هاتووە. لەبەردەم قوتابخانەدا گرتوویانە و شوێنی ساغیان نەهێشتووە. دواتریش لە شوێنێکی چۆڵدا فڕێیان داوە.

دوای ئەو ڕووداوە باپیرم لە ترسی گیانی خۆی لەو هاوسەرگیرییە پەشیمان بۆتەوە. هەڕەشە و گوڕەشەکانی مەحمود ئاغاش پەیتا پەیتا بەردەوام بووە.

دایکی بەستەزمانیشم لە ترس و بێدەسەڵاتیدا تاکە دڵنەوایی خۆی لە گریاندا دیوەتەوە. شەوان تا بەری بەیان لە خوای گەورە پاڕاوەتەوە و داوای چارەی لێ کردووە. ڕۆژبەڕۆژ خۆشەویستی باوکم لە دڵی دایکمدا گەشەی سەندووە، بەڵام کە دیوێتی بەیەکگەیشتن ئەستەمە، هیوای بڕاوە و هێزی ئەژنۆی نەماوە. ئەو دوو گەنجەی کە ژیانیان سەرەوژێربووە، هیچ شتێکیان لەدەست نەهاتووە جگە لە پاڕانەوە لە دەرگانەی خوای گەورەدا.

کاتێك ئەمان لەم بێچارەیی‌یەدا بوون، پوورم بەرگەی حاڵی جەرگبڕی دایکمی نەگرتووە و، هەڕەشەکانی مەحمود ئاغای بە هیچ داناوە و هەواڵی بۆ باوکم ناردووە کە بێت قسەی لەسەر بکەن. باوکیشم شەوێك بەدزییەوە چووەتە ماڵی پووری دایکم، چونکە ئەگەر هەم ماڵی باپیرم و هەم مەحمود ئاغا بیبیستایە، کۆتایی یەکەی خراپ دەبوو..

## کۆبوونەوەکەی ماڵمان:

پووری دایکم دوای گەیشتنی باوکم ناردوویەتی ماموستا عبداللەش بێت. شەو درەنگانێك کۆبوونەتەوە.

پووریّ ژنێکی ژیر و بەسەلیقە و کارزان بوو. هەر بۆیە کۆبوونەوەیەکی ئاوای ڕێکخستوو بوو. وتوویەتی:

– مەحمود ئاغا چاوی بڕیوەتە ئەم کچە و مرخی لێی خۆش کردووە. کابرایەکی تابلێی ستەمکارە. ئێستا پێویستە ئێمە چی بکەین؟

باوکم وەك گەنجێکی خوێنگەرم هەستاوەتە سەرپێ و، قیڕاندوویەتی:

– (نادیدە) نادەمە کەس. نایدەم گەر کۆتاییەکەشی مەرگ بێت. دەبێت سەرەتا بمکوژن ئنجا دەتوانن بیبەن.

ئەم چاوقایمییەی باوکم ئاوی کردووە بە دڵی دایکمدا. سەرلەنوێ هیوای بووژاندۆتەوە لە ڕۆحی ژانکێشیدا و، دوای چەندەها ڕۆژ لە گریان خەندەی ئاڵی خستۆتە سەر ڕوومەتی.

مامۆستا فەرموویەتی:

– پەلە مەکەن. مردن و کوشتن لەئارادا نیە. گەر ئاوا بە خوێنگەرمیی دەست پێبکەین کۆتایی یەکەی مەترسیدار دەبێت.

– چۆن هێشتا هیچ نەبووە؟! گەر جارێکی تر بەسەرماندا بدەنەوە لەوانەیە (نادیدە) بڕفێنن. ئەوکات هەموو شتێك کۆتایی دێت. بەڕای من پێش ئەوەی ئەوان بکەونە خۆیان، ڕێمان بدەن ئێمە هەڵێین.

لە بەرامبەر ئەم پێشنیارەوە دڵی دایکم تەواو ئاسوودە بووە. چونکە ئامادە بووە لەپێناو باوکمدا هەموو شتێك بکات. گەر هەڵهاتن و مردنیش بێت، بە خۆشحاڵییەوە ڕازی بووە. بەس ئەوەندە لە باوکم جیانەبووایەتەوە..

پوورم وتوویەتی:

– مەحمود ئاغا بە گاڵتەی نییە. کوڕەکەشی وەك خۆی بێ دین و بێ ئیمانە. یەکەم ژنیشی ئاوا هێناوە، ئێستا وازی لێ هێناوە و نۆرەی ئێمەیە. نابێت بهێڵین ئێمەش هەمان شتمان بەسەر بێت.

باوکم وتوویەتی:

– بۆیە تاقە ڕێگا هەڵهاتنە و دەرچوونە لەم ناوە..

مامۆستا عبدالله:

– کێشەیەکی جددی لە ئارادایە. بەڵام پێویستە کێشەکان بە ژێری چارەسەربکرێن نەك بە هەست و سۆزی کاتی و، ئەم چارەسەرەش دەبێت لەگەڵ دین و ئەقڵ گونجاوبێت. بەڕای من پێویستە ڕاکردن کۆتا چارە بێت. لە ئێستادا مەترسییەك نییە لەسەر گیان و شەرەف. بۆ ئەوەی مەسەلەی ڕاکردن حەڵاڵ بێت پێویستە گشت هۆکارە ڕێ پێدراوەکان تەواوبکەین. ئەگینا هیچ خاوەن ئەقڵێك ڕاکردنی پێ باش نییە. ئەوکات ئێمە وەڵامی هەڵەمان بە هەڵە داوەتەوە، کە دیارە شتێکی ژیرانە نییە.

– دەمێکە هەڵهاتن بووەتە پێویستی. گشت خراپەیەکیان کرد. هەر ئەوە ماوە (نادیدە) بڕفێنن. گەر ئەوەش بکەن ئەوکاتە خۆشمان بکوژین ئەنجامەکەمان بۆ ناگۆڕێت.

مامۆستا عبدالله بەردەوام بووە لەسەر خوێنساردی و هێورکردنەوەی دۆخەکە:

– کەمێك لەسەرخۆبن، دەبێت هەموو شتێك بەگوێرەی خۆی بکەین. دەبێت خەڵك بڵێن:" هەزارانە هیچ چارەیەکی تریان نەما". تا ئێستا هێشتا بە ڕەسمی نەهاتوونەتە داوای. بەپێی ڕێ و ڕەسم پێویستە بێنە داخوازی. دوای ئەوە ئێمەش بەگوێرەی پێشهاتەکان پلانێك دادەنێین.

– ئاخر مامۆستا گیان تۆ باسی حاڵەتێکی ئاسایی دەکەیت، بەڵام ئێمە هەنووکە لە دۆخێکی نائاسایی داین. کێ چی دەڵێت با بیڵێت. پێویستە پێش ئەوەی ئەوان بکەونەوە خۆیان ئێمە لەم ناوە نەمێنین. چارەیەکی ترمان نییە.

- دوێنێ ڕەزای کوڕی مەحمود ئاغا هات بۆ لام. هەڕەشەی لێ کردم و وتی:" مامۆستا قەناعەتیان پێ بکە. دەزانین کە تۆش دەستێکت لەم کارەدا هەیە. ئەگەر بڵێن نەخێر بۆ تۆش باش نابێت". منیش وتم ئێ وەرن داوای بکەن. خێزانەکە بڕیاری خۆیان دەدەن. ئەگەر لە منیشیان پرسی ڕای خۆم دەڵێم. وتی: دەڵێیت چی مامۆستا؟ وتم: وەکو مامۆستایەکی ئایینی چی حەق و ڕاستی بێت ئەوە دەڵێم. کە تێگەیشت تووڕەبوو و تا توانی جوێنی دا و هەڵیتوڕاند.

بە ڕای من با بێن بیخوازن، ئێوەش بڵێن با بیرێکی لێ بکەینەوە. دواتریش هەواڵ دەنێرین کە کچەکە ڕازی نییە.

دوای ئەم هەواڵە ئەوان دەکەونە جووڵە. ئێوەش خەبەر دەدەنە پۆلیس. بە شێوەیە بە ڕەسمی دەسەلمێت کە مەحمود ئاغا دەیەوێت بەزۆر (نادیدە) بڕفێنێت. ئەوکاتیش ڕاکردنتان ئاسان دەبێت. هەم هەموو هۆکارەکان دەگیرێنە بەر و، هەم کارەکە دەبێتە شتێکی ڕەسمی لای دەوڵەت و هەم خەڵکیش پشتگیریمان دەکەن و دەڵێن:" بەس نەبوو ڕایکرد ئەو کچە بەستەزمانە، ئەگینا بەزۆر دەیانبرد". ئێمەش ویژدانمان ئاسوودە دەبێت و بەرپرسیارێتیمان نامێنێت. پوورم وتوویەتی:

- مامۆستا گیان ئێوە وەك پیاوێکی ئایینی ئەوە دەفەرموون کە پێویستە، بەڵام دەبینین کە کارەکە زۆر ئاڵۆز و گرانە. پێویستە ئێمە لێرەدا کارەکەمان مسۆگەر بکەین و دڵنیاببین، نەوەك ڕووداوەکان بەو شێوەیەی کە ئێوە دەیڵێن نەچنە پێش. یەکەم هەنگاو بۆ ڕێگری کردن لە ستەمکایی مەحمود ئاغا ئەوەیە ئێمە ئەم دوو لاوە لە یەکتر مارەبکەین. تا بەئاسانی یەکتر ببینن و بدوێن، ئەگەر پێویستیشی کرد کە هەڵبێن، با هیچ ڕێگرێك لە بەردەمیاندا نەبێت.

لەگەڵ ئەم پێشنیارەی پوورمدا دایك و باوكم لە خۆشیدا جێیان بە خۆیان نەگرتووە. دایكی داماوم ئەوەندە دڵخۆش بووە بۆ یەكەم جار لە ژیانیدا فرمێسكی شادی ڕشتووە.

مامۆستا عبدالله پاش كەمێك بیركردنەوە وتوویەتی:

– مادەم ئێوە ڕاتان وایە، تەنها دوعای خێر و مارەبڕین بۆ من دەمێنێتەوە. ماڵی كچ ڕازین، بەڵام ئەی ماڵی كوڕ؟

پوورم:

– خەمت نەبێت مامۆستا، هەر لە زووەوە ڕازین. بۆیە بەئاشكرا دەریان نەبڕیوە چونكە لە مەحمود ئاغا دەترسن. هەر ئێستا دەنێرین بەشوێن باوكیدا. مۆڵەتی ئەوانیش وەردەگرین. هەر ئەو شەوە مامۆستا مارەی كردوون لەیەك و بڵاوەیان لێ كردووە.

## ستەمكاریی مەحمود ئاغا:

تومەز لە ئێوارەوە پیاوەكانی مەحمود ئاغا تاقیبی باوكم و مامۆستا عبداللەیان كردووە، هەر ئەوەندەی لە ماڵ چوونەتە دەر بەزۆر سواری سەیارەیەكیان كردوون و بردوویانن. چەند كەسێكیشیان هەڵیان كوتاوەتە سەر ماڵەوە و، لە پوورمیان داوە و دەست و قاچی دایكمیان بەستووە و ڕفاندوویانە.

مەحمود ئاغای زاڵم بەزەیی نەهاتووەتەوە بە خۆشەویستی دایك و باوكمدا. تەنانەت هیچ ڕێزێكیشی لە مامۆستا نەگرتووە كە هەموو خەڵكی دەستیان بەسنگەوە گرتووە بۆی.

بیردەكەمەوە كە چۆن دایك و باوكم بەرگەی ئەو هەموو ئازار و ناڕەحەتییەیان گرتووە و كۆڵیان نەداوە؟ تەنها بیركردنەوە بەلا و چەرمەسەرییانە لەرز لە جەستەی مرۆڤ دەهێنێت.

مامۆستا عبدالله و باوکمیان بردۆتە جێیەکی تەنیا و چەپەك. تا بەیانی تێیان هەڵداون و سووکایەتی یان پێکردوون. پاشان بەر گوللەیان داون و وایان زانیوە کە مردوون بەجێیان هێشتوون.

مامۆستا کە پیاوێکی بەڕێزی ئەو ناوچەیە بووە و حەقی بەسەر هەموو کەسێکی ئەو ناوەوە هەبووە، هەر لەویادا گیانی دەرچووە. بەداخەوە هیچ جێیەکی ساغی ئەو پیاوە دیندارەیان نەهێشتۆتەوە. باوکیشم بە لوتفی خوایی نەمردووە و شوانێك دۆزیویێتیەوە و بردوویەتی بۆ نەخۆشخانە. چەند گوللەیەکی پێوە بووە و دەست و قاچی شکاون، بەڵام خۆشبەختانە شوێنی کاریگەری نەپێکاوە.

خوایە گیان! تۆ بڕواننە ئەو زوڵم و ستەمە! تەنانەت بیرکردنەوە لێی مرۆڤ دەترسێنێت. بۆ ئەوەی کەسێك بتوانێت ئەوەندە دڕندە و بێبەزەیی بێت، دەبێت جانەوەرێکی خوێنڕێژبێت. باشە وا وتمان باوکم ویستوویەتی دایکم بهێنێت، ئەی مامۆستا عبدالله؟ ئەو چ تاوانێکی هەبووە؟

ئەوەی دایکیشم بەسەری هاتووە نە زمان دەتوانێت باسی بکات و، نە دڵ بەرگەی دەگرێت و نە ویژدان توانای هەڵگرتنی هەیە. تاقە پەناگەی پاڕانەوە لە خوای میهرەبان و، دڵنەواییشی ئەو فرمێسکانەبوون کە کوڵیان نەدەنیشتەوە.

## زللەیەکی خوایی:

ڕەزای کوڕی مەحمود ئاغا و دوو پیاوی تر دایکمیان ڕفاندووبوو. بەدرێژایی ڕێ دایکم وای زانیوە کە چیتر هەموو شتێك تەواوبووە و لە ترسی ئەوەی یادگاری پاکی باوکم بپارێزێت و نەهێڵێت لەکە بکەوێتە سەر مارەیی و ناموسی، بیری لە مردن کردۆتەوە. لە ناخیەوە و لە قووڵایی دڵیەوە هاواری کردووە و پاڕاوەتەوە. ئەوەندە بەکوڵ لاڵاوەتەوە، قیژاندوویەتی:

– خوایە گیان لەکوێی؟ خەریکن ناموسی ئەم بەندەیەت لەکەدار دەکەن، کێ دەیپارێزێت؟ بگە بە هانامەوە. من بە ئیمان و داوێنی پاکەوە دەمەوێت بگەڕێمەوە لات. دەمەوێت بەندەیەکی شایانی تۆ بم کە هاتمە خزمەتت. مەهێڵە پیسم بکەن خوایەگیان!

قیژە و هاواری دایکم بەجۆرێك پاك و بێگەرد بووە وەکو بۆمبێك بە دەموچاوی ئەوانەدا تەقیوەتەوە کە ڕفاندوویانە و تووشی پەشۆکانی کردوون. خوای جیهانیان کە پارێزەری بەندە زەبوونەکانیەتی و دوژمنی ستەمکارانە، مەگەر دەکرێت وەڵامی ئەو داوا بەکوڵە نەداتەوە؟ مەگەر دەبێت گوێ نەداتە بڵێسەی ئەوینی هەناوی دایکم؟

وەختێك ڕەزا بەنیازبووە بە نیەتی خراپ لە دایکم نزیك بێتەوە، لەناکاو تڕێلەیەك بەرەو ڕوویان هاتووە. وەك ئەوەی قین و خەشمێکی زۆری لێیان هەبێت، خۆی کێشاوە بە سەیارەکەیاندا و پارچە پارچەی کردووە.

دایکم لەژێر دارێکدا خۆی دیوەتەوە. بەڵام خوا پارێزگاری لێ کردووە و بێ ئەوەی شوێنێکی بڕووشێت ڕزگاری بووە. ڕەزای دوژمنی ناموسیش پارچەیەك ئاسن لە قوڕگی چەقیوە و لاشەی ستەمکاری بێگیان کەوتووە. بەجۆرێك خوێن پڕاوە بەو ناوەدا کە هیچ کەسێك نەیتوانیوە بە دەمیانەوە بچێت. وەك بڵێی دەستێکی نادیار بەتایبەتی کۆتاییەکی ئاوای بۆ هەڵبژاردووە. دوو پیاوەکەی تریش بریندار بوون. یەکێکیان بە ترس و سەرسوڕمانەوە بە دایکمی وتووە:

– توخوا دوعامان لێ مەکە دادە گیان! ئێمە خزمەتکاری ئەوانین، فەرمانی چیمان پێبکەن ئەوە دەکەین. ماڵ و منداڵمان وردە. زۆر لە دێ دوور نەکەوتووینەتەوە. دەتوانیت بگەڕێیتەوە. دەی بڕۆ، باسی ئێمەش بۆ کەس مەکە.

ئـەی خـوای لێقـەوماوان! ئـەی ئـەو خوایـەی کـە میهرەبـان و دادپەروەری! کێ دەتوانێت لـە دادی ئیلاهـی تـۆ هـەڵبێت؟ مەگـەر خـوای گەورە بەندەکانی لە گێژاودا دەهێڵێتەوە؟ بەندەیەك کە باوەڕی پێیـەتی و خۆشیدەوێت، دەیداتە دەست ستەمکاران؟

دایکم بە شەو ڕێی ماڵەوەی گرتووە و، بە هەناسەبڕکێ گەیشتۆتەوە و پووری دیوە لە ئازار و ژاندا پەلەقاژەی کردووە. لەو حاڵە تاقەتپڕووکێنەدا دەستیان کردۆتە ملی یەك و تێر گریاون. هـیچ نـەبێت لـە خۆشـی ئـەوەی نامووسیان ڕزگاری بووە، سوژدەی سوپاسگوزارییان بردووە.

دایکم خۆی بە تاوانبار زانیوە و پێی وابـووە کـە هۆکـاری گشـت بـەڵاو موسیبەتەکانە. هـەر لەبـەر خۆیـەوە وتوویـەتی و کڕووزاوەتـەوە: " ئۆبـاڵی مامۆستا لە ئەستۆی منە. ئەی دەبێت عـارف گیـان چـی بەسـەر هاتبێـت؟ خۆزگە هەزارجار دەمردم و ئەمانەم بەچاوی خۆم نەدەبینی".

## کۆتایی مەحمود ئاغا:

تـۆ بڕواننـە حیکمـەتی خـوای گـەورە، مـەحمود ئاغایـەك کـە نـاوی بـە سـتەمکاری دەرچـووە، لەگـەڵ هەواڵەکـەی بیسـتووە، لـە شـوێنی خۆیـدا توشی ئیفلیجی هاتووە و لە جێدا کـەوتووە. هـەواڵی بـۆ دایکـم نـاردووە و وتوویەتی:" با گەردنم ئازاد بکات، لەمـەودوا وەکـو کچـی خـۆم ئاگـام لێـی دەبێت". کاتێك هەستی بە بۆنی مەرگ کردووە لەبەر کونی لووتیدا هـەموو شتێك تێگەیشتووە.

باوکم سێ مانگ لـە نەخۆشـخانەدا ماوەتـەوە. سـوپاس بـۆ خـوا چـاك بووەتەوە و تووشی هیچ کەمئەندامییەك نەبووە.

دوای هەموو ئەم ڕووداوانە زەماوەندێکی سادەیان ڕێکخسـتووە، بـەڵام گیروگرفت بۆ ساتێك یەخەی بەرنەداون.

## دوا ساتە پڕپەندەکانی پوورم:

ڕۆژی زەماوەند دیاریکراوە و هەموو ئامادەکارییەکان تەواوبوون. وەلێ بەیانی ڕۆژی زەماوەند پووری دایکم کۆچی دوایی کردووە. مردنێك کە لەو ڕۆژەوەی بیستوومە لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە و دەڵێم:" خوایەگیان مردنێکی وام بە نسیب بکە"!

پوورم شەوەکەی دایکمی خەبەرکردووەتەوە و وتوویەتی:" ڕۆڵە من دەڕۆم. یارمەتیم بدە خۆم بشۆم و دەستنوێژ هەڵبگرم".

دایکم جوان شتوویەتی و جلی نوێی لەبەرکردووە. پووری ڕووی کردۆتە قیبلە و قورئانی پیرۆزی گرتۆتە دەستی و تا نوێژی بەیانی خوێندوویەتیەوە. لە پاڕانەوە و لالانەوە هیچ نەوەستاوە. ئەوەندە لە دڵەوە و بەکوڵ دوعای کردووە، دایکیشم بۆ ساتێك نەیتوانیوە فرمێسکەکانی ڕابگرێت. پاشان دایکمی لەبەردەم خۆیدا دانیشاندووە و وتوویەتی:

– کچم شتێك هەیە کە دەبێت پێتی بڵێم. دوێنێ شەو لە خەومدا ڕەحمەتیم بینی، ڕەحمەتیی مێردم، بانگی دەکردم، کەمم ماوە لە دنیادا. کچم تۆ جوان و گەنجیت، ئەو ڕووداوانەی بەسەر تۆدا هاتن زوو پێیانگەیاندیت. بە جوانی و لاویت مەخەڵەتێ. بزانە کە هەموو جوانێك وەکو هەر ناشیرینێك بە یەکسانی دەچنە حزووری خوا. تۆ ئەو ئەرکەی بەرامبەر خوا هەتە جێبەجێی بکە تا ڕووت بێت شتێکی لێ داوابکەیت. جلێك لەبەر مەکە خەڵکی ئێرەییت پێببەن، چاوی پیس و دوژمن بۆ خۆت زیاد بکەیت. غەیبەتی کەس مەکە ئەگینا ئاسوودەیی دەروونت لێ ون دەبێت. بێ دەستنوێژ مەگەڕێ چونکە ئەوە ناشکوری یە بەرامبەر نیعمەتەکان. پەرستشەکانت پشتگوێ مەخە ئەگینا میهرەبانی خوایی دەدۆڕێنیت. نرخی مێردەکەت بزانە. وا بزانە ماڵەکەت بەهەشتە. دۆستی

باش هەڵبژێرە. حەرام مەخۆ و زیادەڕەوی مەکە. بزانە کە چاکە ڕەحمەتی خواییت لێ نزیك دەخاتەوە و خراپەش تووڕەیی.. گەر بەڵایەکت بەسەر هات پەنا بە خوا بگرە. بیرت نەچێت ئەم ژیانە جێی ماندووبوون و کۆششە نەك خۆشی و ڕابواردن. ئارام بگرە، ئارام بگرە تا شایانی بەهەشت بیت. دەمێکە دەمەوێت شتێکت پێ بڵێم، هەر لەبیرم دەچێت. ئێستا وەختێتی. مامۆستا عبداللەی ڕەحمەتی –نازانم لە خەویدا دیویێتی یان هاتووەتە دڵیەوە– پێی وتم: " بە نادیدەی کچم بڵێ کە ئارام بگرێت. ئیشەڵا بەوە دەگات کە دەیەوێت، بەڵام تاقیکردنەوەی ئەو بەوە تەواو نابێت. گەر ئارامی لەسەر بگرێت ئەو تاقیکردنەوەیە دوارۆژی مسۆگەر دەکات. "

دەمەو بەیانی پووریێ سەری ناوەتە سەر بەرماڵەکە و دوای شایەتومان هێنان گیانی دەرچووە.

پووریێ کە هەموو ژیانی پڕ لە کوێرەوەری و ناڕەحەتی بوە و، دایکمی گەورە کردووە و داوێتی بەو مێردەی خۆی دەیەوێت، دوای ئەوە گەڕاوەتەوە دەرگانەی خوای حەق. ڕۆیشت بۆ لای مێردە شەهیدەکەی کە بیست ساڵ لەوەوپێش کۆچی کردبوو.

خوایەگیان چی دەبێت، کۆتایی ئێمەش با ئاوا جوان بێت! ئامین..

## هەروەك لەیلا و مەجنون

خۆشەویستی و هۆگریی نێوان دایك و باوکم ئەوە نەبووە دوای بەیەکگەیشتن و هاوسەرێتی کەم بکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە ڕۆژبەڕۆژ پتربووە. هەر ساتە و زیاتر وابەستەی یەکتربوون. وەك بڵێی بترسن لەوەی لە داهاتوویەکی نزیکدا جودایی بکەوێتە نێوانیانەوە.

بەداخەوە هەر واش بوو..

زۆری نەبرد بە شەهیدبوونی باوکم ژیانی دایکم دارما و ئومێد و خەیاڵەکانی بوونە خۆڵەمێشی دوای ئاگر. دەتووت چیتر ئەو لەم دنیایەدا

ناژی. تەرمێکی زیندوو بوو کە لەگەڵ یادگاری باوکی کۆچکردووم دەژیا. هەستەکانی بەڕووی ئەم دنیایەدا داخرابوون و ڕوویان کردبووە جیهانی ئەودیو.

کەس لە دەرەوە دایکمی نەدەدی. هەمیشە لەسەر بەرماڵەکەی دەپاڕایەوە. دەیویست چی زووە ئەویش بگات بە باوکم. منیش شەوان تا بەیان لە ئاە و ناڵەی دایکم خەو نەدەچووە چاوم. هاواری گەرمی سینەیی و فرمێسکی گەرمی سەر ڕوومەتی و ناڵەی حەزینی لاوانەوە، ئەو دیمەنانەبوون کە منداڵی منیان پڕکردبوو.

## دایکم هەر وڕێنەی بە باوکمەوە دەکرد:

دۆست و خزمان زۆر هاتن و چوون نەیانتوانی دایکم بگەڕێننەوە دۆخی جارانی. نەیانتوانی لەو جیهانە تایبەتییەی دابڕنن.

شەوێك تێنەدەپەڕی دایکم ڕانەپەڕێتە سەرپێ و نەڵێت:" عارفی من هات. عارف گیان ئەوە هاتم. عارف ئەوە تۆیت؟ عارف لەکوێیت؟".

تاقیکردنەوەی دایکم تەواونەبووبوو، بەڵکو تا دەهات قورستر دەبوو. کاتێك دایکم لە دنیای تایبەتیی خۆیدا دەژیا، ڕووداوێك ڕوویدا کە ئەوەندەی تر دایکمی پەرێشان کرد و باری شانی گرانتر کرد.

دوای مەرگی باوکم نەخۆشی شەکرەی باپیرم پەرەی سەند و سەرەتا چاوی لەدەست دا و پاشان تووشی نەخۆشی گورچیلە بوو.

مامێکم لەگەڵماندا بوو کە لە باوکم بچووکتربوو، کاروباری ماڵەکەی بەڕێ دەکرد. جاروباریش دەهاتە سەردانی ئێمە و یارمەتی دەداین.

نەنکم و باپیرم دەیانویست بەپێی عادەتی ئەو سەردەمە دایکم لە مامم مارەبکەن. دەیان وت: "با لەم ماڵە نەچێتە دەرەوە و لەبەر چاوماندا بێت. با کەسی غەریبە تێکەڵاومان نەبێت". دایکم کە ئەمەی بیست شێت و

هاربوو. قیامەتی هەڵگیرساند و دەیقیژاند:" چۆن خیانەت لە ئەمانەتەکەی عارف دەکەن؟".

بەڵام ئازارەکان کۆتاییان نەدەهات. دایکی داماوم کە تازەبەتازە خەریك بوو دەهاتەوە سەر خۆی، کەچی دەیان ویست بیدەن بە هێوەرەکەی. لەوانەیە بیتوانیایە بەرگەی هەموو ئازارێك بگرێت، بەڵام ئەمەیان نا..چۆن یەکێکی تر دەتوانێت شوێنی باوکم بگرێتەوە کە هەموو ژیانی دایکمی ڕازاندۆتەوە؟؟

بەداخەوە پەلەقاژە و بەرەنگاربوونەوەکەی هیچ ئەنجامێکی نەبوو. ئەو پەستانەی کە دەوروبەر خستبوویانە سەر باپیرم بەتەواوی ئەو کەڵکەڵەیەیان لە مێشکیدا چەسپاندبوو.

دایکم دیسان ڕووخایەوە. هیچ لە دایکم تێ نەدەگەیشتن. هەستیان بە خۆشەویستی و ئاگری ئەوینی دڵی نەدەکرد. وایان دەزانی ژنێکی ئاساییە. بەلای ئەوانەوە سادە و ئاسان بوو. دەیان وت:" قەیدی چییە ئەم نا ئەو، خۆ قاتی نەبووە". نەیاندەزانی کە باوکم بۆ دایکم بەقەدەر گیان، بەقەدەر ئاو و هەوا و نان پێویستە. باپیرم و ئەوانەی کە بووبوونە کۆیلەی عادەت و ڕێ و ڕەسم ئا لەمە تێنەدەگەیشتن..

پاڕانەوە و داد و بێدادی دایکم چارەیەکی نەبوو. لەهەر کێ دەلالایەوە ئەنجامی نەبوو. چوو لە باپیرم، لە نەنکم، لە پورە عیففەتی ژنی ناوداری دێ کڕووزایەوە، بەڵام نەبوو و نەبوو..

من ئەو ڕۆژانەم ئەگەرچی بەڕوونیش نەبێت، وەلێ ڕووداوە سەرەکییەکانم لە یادە. مەگەر دەشێت لەبیرم بچنەوە؟ چاوی ئاوساو و پڕخوێنی دایکم شتێك نییە بەئاسانی لەبیربکرێت.

ئاه دایکی هەژارم ئاه! چ بەڵا و سۆیەکت تووش بووە! دەبێت چ دڵێکی گەورە و چ عیشقێکی مەزنت هەبووبێت وا توانیوتە بەرگەی هەموو ئەوانە بگریت؟

هەنووکە من کە سەیری یادگارییەکانی ژیانی خۆم دەکەم شەرم دام دەگرێت و سوور هەڵدەگەڕێم. بەناوی عەشق و خۆشەویستییەوە کەوتووینەتە ناو هەزار ویەك پیسییەوە. کەچی خۆشەویستی نێوان باوك و دایکم پاك و بێگەرد و پیرۆز و ئاسمانی بووە. بەداخەوە ئێمەومانان لەم سەردەمەدا ناشیرینترین جۆریمان بینی.

## دایکم لە مامم دەپاڕایەوە:

مامە فاروقم هەم لە باوکم و هەم لە دایکیشم بچووکتربوو. وەکو کۆتا هەوڵ دایکم مامی بانگ کرد بۆ ماڵمان. دەیویست ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵ بکات و ئەو بابەتە ببڕێنێتەوە. بەڵام باپیرم و قسە و قسەلۆکی دەوروبەر مامیشمیان خەڵەتاندبوو. مامم دەیویست ئەو هاوسەرگیرییە بکات چونکە بە مەسەلەی نامووس و شەرەف تێگەیشتبوو.

پێیان وتبوو:" دەبێت هەر بیهێنیت. ئەمە نامووسی ئێوەیە. دەتانەوێت کەسێکی غەریبە ببێتە مێردی ژنەکەی عارف؟ تۆ بیبە ماڵی خۆت، لە سەرەتاوە تۆزێك بەرەنگاردەبێتەوە و کەللەڕەقی دەکات، بەڵام زۆر نابات هەموو شتێك باش دەبێت. بێگومان ناتوانێت تا ماوەیەك مێردەکەی لەبیربکات، وەلێ دواتر ڕادێت".

مامم ئا بەم قسانە خەڵەتابوو، وای دەزانی بەمە کارێکی زۆر گرنگ دەکات و ناهێڵێت کەسی غەریبە توخنی براژنەکەی بکەوێت.

بەڵام شتێك هەبوو کە هەم باپیرم و مامم و هەم خزمانی تریش لەبیریان کردبوو. دایکم تەنها گۆشت و خوێن نەبوو. و تەنها ژنێك و بووکی ماڵێك نەبوو. عارفێك هەبوو لە دڵی ئەودا. بەڵام کەس نەیدەویست ئەمە

ببینێت. کەس تێنەدەگەیشت کە گەر یادگاری و خەیاڵی ئەو نەبێت، دایکم یەك چرکە ناتوانێت بژی. شووکردن بە پیاوێکی تر بەلایەوە گەورەترین ئازار و خیانەتە..

دایکم کەوتە پاڕانەوە لەبەردەم مامما. دەیووت:

– هیچ نەبێت تۆ وا مەکە. من کەڵکم بۆ تۆ نییە. من لەگەڵ عارفدا مردم. تەرمێکی زیندووم و تەواو. هەموو ساتێکم لەگەڵ ئەودایە. چۆن دەتوانیت دەست بدەیت لە ئەمانەت و یادگاری براگەورەکەت؟ هیچ بەزەییت نییە؟ بۆچی بۆ تەنها جارێکیش بێت گوێم لێ ناگرن؟ تۆ دەتوانیت لەناو ئاگردا بژیت؟ دەتوانیت لە ئاودا هەناسە بدەیت؟ گەر دەم و لووتت ببەستن چەندێك بەرگە دەگریت؟ شووکردنی منیش بە یەکێکی تر ئاوایە. جیابوونەوە لە عارف بۆ من سووتان و خنکانە. چی دەبێت پیاوەتی و جوامێری بنوێنە و بەگوێیان مەکە!

مامم خۆی پێنەگیرا و دەستی کردە گریان:

– منیش ئەمەم ناوێت براژن. ئەمە بۆ من ئازار و ئەشکەنجەیە، بەلام چی بکەم؟ ناتوانم بەسەر قسەی گەورەکاندا زاڵ ببم. نایانەوێت بتدەن بە کەسی تر، ترسیان لەوە هەیە.

–کەس توخنی ئێمە ناکەوێت. یەکێك بەو نیەتەوە بێت دەری دەکەم و گەر پێویستیش بکات دەیخنکێنم. هەمووتان باش بزانن کە من تەمەنم لەم ماڵەدا و لەگەڵ منداڵەکەی عارف و یادگارییەکانی بەسەردەبەم. هیچ پیاوێکی غەریبە نایەتە ئەم ماڵەوە. سەرردانی ئێوەش دەکەم. دێم خزمەتی دایك و باوکت دەکەم. بەلام با وازم لێ بێنن.

مامم نەیتوانی بەرگەی گریان و ناڵەی دایکم بگرێت و بەپەلە چووە دەرەوە. وەلێ دایکم کوڵی نەدەنیشتەوە و دەیووت:" عارفەکەم گوێت

لێیە؟ حاڵی پەرێشانم دەبینیت؟ چیتر بەرگە ناگرم. توخوا منیش بەرە بۆ لای خۆت، هێزم لەبەر بڕاوە".

### ئەنجامەکەی کارەساتێکی تەواوبوو:

ئەو ئازار و ڕەنجەی دایکم دەیکێشا جەرگبڕبوو. بەتاقی تەنیا ململانێ لەگەڵ ئەو هەموو ناڕەحەتییە کۆڵێك نەبوو ئافرەتێکی لاواز بتوانێت هەڵیبگرێت. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لەژێر ئەو بارەدا دەپلیشایەوە.

مامم چووبوو باپیرم و خزم و کەسوکار قەناعەت پێبکات، بەڵام ئەوان هەر سووربوون و سوودی نەبووە. وتبوویان: " یا نادیدە بە بووکی دێتە ئەم ماڵە یا جەنازەکەی لەو ماڵەدا دەردەچێت".

مامم هات بۆ ماڵمان. ئەمجارەیان ئەو دەپاڕایەوە:

– پەیمان بێ براژن هەر مارەکردنەکە و تەواو، خوا شایەت بێت تۆ براژنمیت لە دنیاو قیامەتدا و ئەمانەتی براکەمیت.

دایکم دیسان هاواری لێ هەستا:

– نەخێر نابێت! چۆن بەسەر مارەیی عارفدا مارەیییەکی تر دەبڕم؟ ئەو لەگەڵمدایە و گوێم لە هەناسەکانیەتی. تاقە دڵنەواییم ئەوە. من هێشتا لای ئەوم. پارچەیەکم لەو. ئەویش بەرگەی خیانەتێکی وا ناگرێت. لێم دەتۆرێت و جارێکی تر نایەتەوە لام.

دایکم لەپڕ هەستایە سەرپێ و بە چاوی زەق و هەڕەشەوە پەنجەی ڕاوەشاند:

– سەیر بکە فاروق! بۆ ئاخر جار پێت دەڵێم، ئەو هاوسەرگیرییە قەت نابێت، لە من گەڕێ..

ئەوەندە بە تووڕەیی ئەمەی وت مامم ترسا و بەپەلە چووە دواوە. مامم باش تێگەیشتبوو کە ئەو کارە هەرگیز ڕێناکەوێت.

کەچی باپیری کەللەڕەقم کە چاوی نەمابوو و چەند ڕۆژێکی لەم دنیایەدا مابوو، دەیووت:

– پێش مردنی من پێویستە ئەم کارە تەواوببێت..

بەڵام کاروبار لە دەستی خوای گەورەدایە و بێ مۆڵەتی ئەو هیچ شتێك ناتوانرێت بکرێت. با بزانین ئەو چ قەدەرێکی دەستنیشان کردووە..

## ڕووداوێکی پڕ نهێنی:

دایکم هەموو ئێوارەیەك دەرگاکەی کلیل دەدا و، پەردەکانی دادەدایەوە و بەرماڵەکەی ڕادەخست و تا بەیان نوێژ و دوعای دەکرد.

ئێوارەیەکی ئاوابوو. دایکم دەرگاکەی کلۆم دا. بەرماڵەکەی ڕاخست و چووە سەری. منیش بە ئەقڵی منداڵیی خۆم لایەوە دانیشتم و لاساییم دەکردەوە. لەو کاتەدا لە دەرگا درا. پێش دایکم من ڕامکرد، بەڵام دەرگاکەم نەکردەوە. کە دایکم کردیەوە، ژنێکی تەمەن مامناوەندی سەرتاپا داپۆشراوی ڕووخسار نوورانیمان دی. زۆر جوان بوو. وتی:

– سڵاوی خوات لێ بێت خوشکم. میوانی خوام، ڕێم دەدەن بێمە ماڵتانەوە؟

دایکم بێ دوودڵی وتی:

– میوانی خوا بەخێربێت سەرچاوان. گەر بەدڵت بێت ماڵی ئێمە هی تۆیە.

بە (بسم الله) هاتە ژوورەوە و لەسەر کورسی یەك دانیشت. وتی:

– کەمێك ئاوم بدەنێ.

دایکم پەرداخێك ئاوی پێدا. خواردیەوە و نیوەی هێشتەوە. منی بانگ کردە لای خۆی. وتی:

– ها کچم، تۆش قومێك بخۆرەوە.

منێك كه له خه‌ڵكی ده‌سڵه‌میمه‌وه، بێ دوودڵی به ڕاكردن چوومه لای. ده‌توت هێزێكی په‌نهان به‌ره‌و ئه‌و كێشی ده‌كردم. هه‌ر كه بینیم چووه دڵمه‌وه.

ئاوه‌كه‌م خوارده‌وه. كه‌مێك له بنی په‌رداخه‌كه‌دا مابووه‌وه. به دایكمی وت:

– ها كچم تۆش تۆزێك بخۆره‌وه.

سه‌یری چاوه‌كانی دایكمم كرد. بۆ یه‌كه‌م جار خۆشی له نیگاكانیدا به‌دی ده‌كرا. وابزانم دایكم تێگه‌یشتبوو ئه‌و خانمه شیرین و نوورانییه كێیه. خه‌نده كه‌وتبووه سه‌ر لێوه وشكه‌كانی دایكم، چاوه‌كانی كه به گریان ئاوسابوون له دوور ده‌یانڕوانی. دایكم وتی:

– هۆكاری سه‌ردانه‌كه‌تان چییه؟

– هه‌موو شتێكی خواكیان خێره. خوا هیچ كه‌سێك له ته‌نگانه‌دا ناهێڵێته‌وه. به‌ڵام تاقیشیان ده‌كاته‌وه. به‌هه‌شت دوای ئه‌و ئه‌زموونه ده‌به‌خشرێت. ئه‌گه‌ر تاقیكردنه‌وه‌كه گران بوو ئه‌وه بزانن كه خوای گه‌وره ده‌یه‌وێت به‌هه‌شتتان بداتێ.

له دواڕۆژدا جیاوازی نێوان ئه‌وانه‌ی له دنیادا له ناز و نیعمه‌تدا ژیاون و ئه‌وانه‌ی خه‌فه‌ت و مه‌ینه‌تی به‌شیان بووه، ده‌رده‌كه‌وێت. خوای میهره‌بان و به‌خشنده به‌هه‌شتێكی وا ده‌به‌خشێته میحنه‌ت كێشان، ئه‌وانه‌ی وا له دنیادا له خۆشیدابوون ئێره‌یی‌یان پێ ده‌به‌ن و ده‌ڵێن:" خۆزگه ئێمه‌ش چه‌نده‌ها به‌ڵاو ناڕه‌حه‌تیمان تووش بهاتایه تا جێیه‌كی وا ببوایه‌ته نسیبمان". كچم مه‌ترسه. خوا له تۆ زیاتر تۆی خۆش ده‌وێت و گوێی لێته. تۆ ڕوو بكه ئه‌و. كارت به هیچی تره‌وه نه‌بێت. ئه‌و گشت شتێك له‌جێی خۆیدا ده‌كات. ناهێڵێت هیچ به‌نده‌یه‌كی سته‌می ناڕه‌وای لێ بكرێت و هه‌قی ده‌ستێنێت. گه‌ر كه‌سێك خۆشه‌ویستێكی وه‌ك خوای هه‌بێت پێویست

ناكات لە دەرگای کەسی تر بدات و داوای یارمەتییان لیّ بکات و لیّیان بپارێتەوە. نیگەران مەبە، کەس دەست نابات بۆ خۆشەویستی پاکی تۆ. خوا ئەمانەتی کەسێك نەپارێزێت کە لەپێناوی ئەودا شەهید بووە، کیّ دەیپارێزێت؟

دایکم بەو مژدەیە ئەوەندە دڵخۆش بوو کە خۆی بۆ نەگیرا و باوەشی کرد بە میوانەکەدا، دەگریا و دەیووت:

– دەمزانی، دەمزانی خوا ڕێگەیان نادات. دەمزانی تەنها خوا بە ئاگری سینەم دەزانێت. دەمزانی هیوایەك و مژدەیەك دەنێرێت بۆ ئەم بەندە گوناهبارەی.

میوانەکە دەستی هێنا بە ڕوخساری دایکمدا و نووساندی بەسنگیەوە. داینیشاند و دڵنەوایی دایەوە. منیش چاوم لەو خانمە نەدەترووکاند. ئەوەندە شیرین و دڵگیربوو، مەحاڵ بوو چاومی لیّ کەلا بکەم.

شتێکی تریشی کە تائێستا لەبیرم ماوە بۆنە خۆشەکەی بوو کە دەیبردیت بۆ جیهانێکی تر. دەمبینی دایکم قووڵ قووڵ هەناسە هەڵدەمژێت و دەیەوێت سنگی لەو هەوا بێوێنەیە پڕبکات. دایکم دەگەڕا بزانیّ چیمان هەیە لەماڵەکەدا و بۆ خواردن بشێت، بیخاتە بەردەستی میوانەکە، بەڵام ئەو جگە لە ئاو هیچی تری نەدەخواردەوە.

منی بانگ کرد:

– ناوت چییە کچە جوانەکەم؟

– نیلۆفەر

– ماشەڵا. ئیشەڵا خوای گەورە تۆ لە خۆی جیاناکاتەوە.

– تۆ ناوت چی یە پووریّ؟

وەڵامی نەدامەوە، تەنها بزە گرتی.

پاش ماوەیەك هەستا. شتێكی بەگوێی دایكمدا چرپاند. ڕووی دایكم وەك گوڵ گەشایەوە. پاش چەندەها مانگ بۆ یەكەمجار دایكمم وا خۆشحاڵ بینی.

كاتێك ئەو خانمە ڕۆیشت دایكم زۆری لێ نەكرد بمێنێتەوە. لەوانەشە ئەو خەڵكی جیهانێكی تربوو‌بێت. لە سیما و هەڵسوكەوتیەوە دەردەكەوت كە بە ئێرە نامۆیە. پەرۆشی ئەوەبووم بزانم چی بە دایكم وتووە. كەچی دایكم هەر جارە و بە بەهانەیەك خۆی دەدزی یەوە و لەبری ئەوە وتی:" ژیان كورتە. پێویستە مرۆڤ هەموو كاتێك ئامادەبێت. كەس نازانێت كەی دەمرێت. بۆ دەستەبەركردنی بەختەوەری هەمیشەیی هەوڵ بدە. لەوێ دادگایەكی مەزن هەیە".

لەوانەیە ئەو خانمە ئەمەشی وتبێت، بەڵام ئەوەی گیانی كردبوو بەبەر ژیانی مردووی دایكمەوە، ئەمە نەبوو. ئەڵبەت مژدەیەكی لای باوكمەوە هێناوە یان لە جیهانی نهێنییەوە هەواڵێكی داوە. ئەو ڕووداوە پڕ ڕازەم هەرگیز لەبیرنەچووەوە. هەر جارەش كە دەهاتەوە یادم لەرز دەیگرتم.

## بەرەو دنیایەكی پڕ نهێنی:

دایكم ئەو شەوە پڕ نهێنییەی تا بەیانی لەسەر بەرماڵ بەڕێ كرد. تا نوێژی بەیانی دوعا و تەسبیحات و پاڕانەوەكانی بەردەوام بوون. منی بانگ كردە لای خۆی و ئەو ڕاستییەی پێ وتم كە پێشبینیم كردبوو. وتی:

– كچم، تۆ ئیتر گەورەبوویت. هەموو شتێك تێدەگیت. دەیانەوێت بمدەن بە مامت، بەڵام قەت ئەوە ڕوونادات. ئەگەر دوای من تەنیا مایتەوە دڵتەنگ مەبە. هەموومان دەبێت ڕۆژێك ئەم دنیایە جێبهێڵین. جا ئیتر درەنگ بێت یان زوو. گەر لێرەش جیاببینەوە خوای گەورە لە دواڕۆژدا بەیەكمان شاددەكاتەوە.

گەر مردم نیگەران مەبە. چونکە بە باوکت دەگەم و زۆر خۆشحاڵ دەبم. تۆش بیر لە خۆشبەختی من بکەرەوە و دڵت خۆش بێت کچم. سەیرکە، چەند لێرە بژین ئەوەندە زیاتر ڕەنج دەکێشین. چەند زووتر بە باوکت بگەم ئەوەندە باشترە بۆ من.

دوای من لای مامت بمێنەرەوە. ئەو ئاگای لێت دەبێت و سالی داهاتووش دەتخاتە بەر خوێندن. هەرچەندە لێرە لە تەنیشتتدا ئامادە نابم، وەلێ هەر حەزدەکەم ببینم کە کچەکەم خوێندوویەتی و بووەتە خاوەنی کارێکی باش. ئارەزوو دەکەم کە شارەزای دین و ئیمانی خۆت بیت. نەکەیت من و باوکت شەرمەزار بکەیت..

لەو تەمەنەدا بەڕوونی فامی ئەو قسانەم نەدەکرد، بەلام تێگەیشتبووم کە دایکم لەدەست دەدەم. دیسان زریان و لەرزە ڕوویان لە دلی بچووکم کرد. ئەمەی ئەم جارەیان زۆر جیاواز و بێبەزەیی یانەبوو. مەگەر دەمتوانی بەرگەی بلێسەی ئەو جوودایی‌یە بگرم؟ ترسی ئەوەی لەم جیهانەدا بەتەنیا بمێنمەوە منی تەنیبوو. چۆن دەمتوانی بە تەنها ڕووبەڕووی تەنگانەو داو و تەڵەکانی ژیان بوەستمەوە؟

قسەکانی دایکم خواحافیزی بوو. ڕوون و ئاشکرا ئامادەسازی و هەوالی مەرگ بوو. تێگەیشتم ئەو خانمە نەناسراوە بە دایکمی ڕاگەیاندووە کە ئامادەبێت بۆ سەفەر. وەلێ من چۆن دەمتوانی بێ دایکم بژیم؟ تەمەنێك بەرگەی بێ (ئەو) یم نەدەگرت. مەگەر ژیانێکی لەو جۆرە دەتوانرا بێ بۆن و سێبەر و خۆشەویستی ئەو بەسەرببرێت؟ باوەشم پێدا کرد و وتم:

– توخوا بەجێم مەهێڵە دایە گیان! من بێ تۆ چی بکەم؟ باوکم ڕۆیشت و تۆش دەتەوێت بڕۆیت؟

لێك جیانەبووینەوە. زۆر گریاین پێکەوە و جگەرمان هەلقرچا.

ئەمە چی دەگەیاند بۆ من؟ وشکبوونی ڕەگی ژینم.. تەمەنێك لە ئازار و مەینەتی.. ساڵانێك پڕ لە فرمێسك و ژان..

هەرگیز ئەو ساتی خواحافیزییەم بیرناچێتەوە..

ساڵانێك دواتر تێگەیشتم کە هیچ بۆنێك ناگات بە بۆنی دایکم. هیچ دڵێکی تر وەکو هی دایکم چرۆی میهرەبانی و خۆشەویستی ناگرێت. هیچ کەسێکی تر وەکو دایك نابێتە دۆست..

ژیان ئەمەی لە دوای چەندەها ئەزموونی تاڵ و بەسۆ فێرکردم. بۆ ئەوەی لەمە تێبگەم، چیم مایەوە نەمدۆڕاندبێت؟

ئەو ڕۆژە ئێوارەکەی بڕیاربوو دایکم ببەن و لە مامی مارەبکەن. بگرە هەندێك لە کەلوپەلەکانیشمان گوسترابوونەوە بۆ ماڵی باپیرم. واتە بەزۆر بە بووکی دەیانبرد.

دایکم تەواو حاڵی گۆڕابوو. دەتووت لەم جیهانە دابڕاوە و هۆش و ئاوەزی بەخۆی نەماوە. هەرچیت لێ بپرسیایە وەڵامێکی نەبوو.

نزیکی ئێوارەبوو. من لە ترس و شڵەژانێکی وادابووم کە دەتووت چاوەڕێی مردنی دایکم دەکەم. دەترسام بێن بەزۆر بیبەن و بمرێت. بێ وەستان دوعام دەکرد کە خوایەگیان دایکم هیچی بەسەر نەیەت.

دایکم وەکو پیشەی هەمیشەیی خۆی چووبووە سەر بەرماڵەکەی. گەرچی هەموو ئێوارەیەك دەیکرد، وەلێ ئەمجارەیان زووتر دەستی پێکرد. ئەوێ تەختی بەرز و مەقامی مەزنی دایکم بوو. لەوێدا لەگەڵ باوکم دەدوا و خەم و خەفەتی هەڵدەڕشت و، لەو دەرگایەدا داوا و پێویستی یەکانی ڕیزدەکرد.

دایکم هێشتا بەسەر بەرماڵەکەیەوە بوو. ئەو ئێوارەیە زووتر کەوتبووە ڕاز و نیاز گۆڕینەوە، لە بەیانییەکەیەوە حاڵی سەیر و نامۆ بوو. لەلایەك کەلوپەلەکان دەگوازنەوە و لەلایەکی تر ئامادەسازی بۆ زەماوەند دەکەن،

بەلام هەموو ئەمانە سەرنجی دایکمیان ڕانەدەکێشا. ئەو لە مەقامی خۆیەوە لەگەڵ شوێنێکی تر و بە زمانێکی تر گفتوگۆی دەکرد. دایکم بانگی کردم بۆ لای خۆی و وتی:

– ئەم پارەیە بگرە و بیبە بۆ گوڵزار خان، پارەی قەرزە.

پارەکەم وەرگرت و ڕایکێشام بۆ لای خۆی و نامی بە سنگیەوە و بۆنی پێوە کردم. لەژێر لێوەوە وتی:

– خوا لە خۆیت جیانەکاتەوە کچم!

بەلام ئەوەندە دوعاکەی لە دڵەوەبوو لێوەکانی دەلەرزین و چاوەکانی بە فرمێسک تێزابوون.

نەمزانی ئەوە دوا باوەشە. دوا دیمەنی شانۆی ژینە لەگەڵ ئەودا. ئەگینا قەت بەجێم دەهێشت؟

لە ماڵ دەرچووم. لە لایەکیشەوە کەلوپەلەکانی ماڵمان باردەکران. ماڵی گوڵزارخان نزیك بوو. چوون و هاتنم دە خولەکی نەبرد. پارەی جووتێك پێڵاوی تازەی من بوو کە دایکم بە قەرز لای هێنابوو.

گەڕامەوە. بە ئەقڵی منداڵیم چەند دەقیقەیەك خولامەوە و خۆم گیردا بە سەیری ئەم شت و ئەو شتەوە. چەند کەسێك بەردەوام بوون لە گواستنەوەی ماڵەکە.

چوومە ژوورەکەی دایکمەوە و بینیم لەسەر بەرماڵەکەیەتی و قورئانەکەی ناوە بە سنگیەوە و سەری کەوتووەتە سەر ملی. خانمە نوورانییەکە لە تەنیشتیەوەبوو و شتێکی بۆ دەخوێندەوە. هەم ترسام و هەم زۆر سەریشم سووڕما. نەمدەتوانی مانایەك بەو دیمەنە بدەم. دەمزانی کە شتێکی نائاسایی ڕوودەدات.

دڵم گوشرا و کسپەی لێوە هات. وەك بڵێی ئاگرێك لە سەرمەوە تا نووکی پێم گرتمیەوە. هەموو گیانم دەلەرزی. کە خانمە نوورانییەکە ئەم حاڵەمی دی، وتی:

– مەترسە کچم. دایکت بە باوکت گەیشت. ئازارەکانی تەواوبوون. لەمەودوا خۆشبەخت دەبێت. لێرە بەدواوە شتێك نییە دڵتەنگی بکات. کەسێك بە ڕەحمەتی خوا بگات بەرزترین پلەی دەست کەوتووە. ئەو ئێستا لە بەهەشتدایە. ئەمەی لێرەدایە تەنها جەستەکەیەتی. مەگری و بیر لە خۆشیی دایکت بکەرەوە.

بەڵام چۆن دەمتوانی خۆم بگرم؟ تا هێزم تێدابوو قیژاندم، خۆم دا بەسەر لاشەی بێگیانی دایکمدا و تا برستم لێبڕا گریام. دەکڕووزامەوە و دەمووت:" دایە گیان بۆ جێت هێشتم؟ من ئێستا چی بکەم؟ زۆر دەترسم دایە! دە منیش ببە لەگەڵ خۆت.."

کات بۆ من وەستابوو. چەمکەکانی وەك دنیا و تەمەن و ژیان تێکەڵی یەکتربووبوون. تا ئەو ڕۆژە نەمدەزانی ئازاری جوودایی لە دایکم کە دنیا بچووکەکەی منی سەرەوژێر کرد ئەوەندە سەخت و بەژان دەبێت. چۆن ئارامم بگرتایە؟ چیتر ئەو دایکەم نەبوو کە باوەشی پێدا بکەم و بۆنی خۆشی هەڵبمژم. خەمێکی بێپایان بوو بۆ منداڵێکی شەش ساڵە. مەگەر دەکرا بەرگەی ئەو کۆڵە گرانە بگرم؟

لە بەردەممدا تەمەنێکی پڕ چەرمەسەری هەبوو کە وەك جانەوەر دەمی لێکردبوومەوە و بەنیازبوو پارچەپارچەم بکات. تەنانەت ژیانی لەوەودوام لە هی دایکم تاڵتر و بەسۆتر دەبێت. لە ئاسۆدا ڕەنگی ڕۆژانی زۆر دژوار دەبینران.

## ئازاری سەختی لێك دابڕان:

کاتێك هاتمەوە هۆش خۆم لە دایکمیان جیاکردبوومەوە. دایکمیان درێـژ لەسەر زەوی پاڵخستبوو و پەڕۆیەکی سپییان پێدا دابوو. وتم:

– کوا ژنە میوانەکە؟

ژنێك لە نزیکمەوە وتی:

– ژنی میوانی چی کچم؟

– ژنێکی میوان لێرەبوو، قورئانی لەسەر دایکم دەخوێند.

ژنەکان سەیری یەکیان کرد. یەکێك وتی:

– کاری زۆر لێ کردووە فەقیرە، با بیبەینە دەرەوە، دەبزرکێنێت.

ئیتر ئەو ڕووداوە وەکو نهێنییەك لە دنیای منداڵیمدا مایەوە. دڵنیام کە دایکم کۆچی دوایی کرد بەتەنیا نەبوو و، ئـەو خانمـەی لەگەڵـدا بـوو. بڵێـی کێ بێت؟ لە مێشکی گچکەمدا لەدووی وەڵامی ئەم پرسیارە وێڵبووم.

پوورە عائشە ڕووی کردە ژنانی گوند و وتی:

– بڕوانن و پەند وەربگرن. هەرچەند ئەم ژنە ژیانی پڕبوو لە ناخۆشـی و قوڕبەسەری، بەڵام قەت دیتـان واز لـە نوێـژ و دوعاکـانی بێنێـت؟ دێیـەك زۆریان لێ کرد شووبکات بە هێوەرەکەی، وەلێ ئەو عارفی هەڵبژارد. ئەگەر دوو سەعاتی تر تەمەنی هەبووایە بە بووکی دەبـرا، بـەڵام ئەوەنـدە عـارفی خۆشویست کە خوای گەورە کردیە بووکی ئەو. هەمیشـە ڕاسـت و دروسـت ژیـا و نموونـە بـوو. پـیرۆزت بێـت دووەم بووکێنیـت..پیرۆزت بێـت کۆچـی ئەبەدیت..لێت موبارەك بێت ژینی ڕاستەقینەت.. نادیدە خان، بەڕاستی تۆ نادیدە و بێوێنەبوویت. ئیشەڵا لە حورمەتی ئەوەی لێـرە دراوسـێت بـووین لە دوارۆژدا شەفاعەتمان بۆ دەکەیت.

ژنان دەگریان. لەکاتیکدا هەمووان خەریکی ئامادەسازی زەماوەندی دایکم بوون، ئەو جلی بووکێنی مەعنەوی لەبەرکرد و لە باوەشی فریشتەکاندا فڕی.

دایکمیان ناشت. منێك کە هەمیشە لە گۆڕستان دەترسام، لە دوای ئەوەی دایکم بە خاك سپێررا، بووە ماڵ و لانەی ڕاستەقینەم. ڕۆژانە بە لایەنی کەمەوە جارێك دەچووم بۆ سەردانی و چەند کاتژمێرێك لەسەر گۆڕەکەی چیچکەم دەکرد. گۆڕەکەم وەك بەرماڵەکەی دایکم دەهاتە بەرچاو و لەگەڵی قسەم دەکرد.

تاقە دڵنەواییم سەردانی گۆڕەکەی بوو. کە دەچوومە ئەوێ دڵم ئۆقرەی دەگرت و، بڵێسەی ناخم خامۆش دەبوو و بۆ ساتێك ئازاری جوودایی دەڕەویەوە. دیسان ئێوارەیەکی ئاوا ڕێی گۆڕستانم گرتبوو. دەچوومە سەر گۆڕی دایکم و فرمێسکم هەڵدەڕشت. چونکە ئەو ڕۆژە دڵم پڕبوو. نەنکم پێی وتبووم:" دایکت خۆی کوشت. ئەگەر بە قسەی ئێمەی بکردایە ئێستا لە ماڵ و حاڵی خۆیدا دەبوو".

زۆر پڕبووم و دڵم لە نەنکم ئێشابوو. تاوناتاوێك دەیووت:" بۆ ئەوەندە دەگریت و لوشکە لوشکتە؟ خۆ تۆ یەکەم کەس نیت دایکی مردبێت؟". نیازم بوو بچمە سەر گۆڕی دایکم و هەموو ئەمانەی بۆ بگێڕمەوە. دەمویست بەم سکاڵایانە کەفوکوڵی دڵم بنیشێنمەوە. بەجۆرێك پەلەم بوو وەك بڵێی دایکم بەو هەواڵە زۆر دڵخۆش دەبێت.

کاتێك نزیك بوومەوە بینیم دیسان ئەو ژنە لەسەر گۆڕەکەیەتی. بە زەردەخەنەیەکی هێندە شیرین و دۆستانە پێشوازی لێ کردم، گشت تووڕەییم با بردی. وتی:

– ئەوانە بە دایکت مەڵێ ڕۆڵەکەم. هەمیشە پێی بڵێ کە باشیت. هەواڵی خۆشی بۆ بێنە. دوعای تازە تازە فێرببە و وەرە لێرەدا بیانڵێ.

سالآن تێپەڕین و جارێکی تر ئەو خانمەم نەدییەوە. دیارە چەپەڵی و تاوانی ژیان ئێجگار لێمانەوە ئاڵاوە و ئەو ژنە فریشتەیەمان تۆراندووە.

لاپەڕەی دنیای دایکم تەواوبوو، وەلێ لاپەڕەی کچەکەی ئەوەندە ڕەش و پەڕپوت بوو، مەحاڵ بوو ڕزگاربوون لێی.

ڕێی درێژ و دڕکاوی و دژوار دەستی پێکرد. ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بازرگانانی شەرەف و، خوێنمژان و، خیانەتکاران و ڕووخسارە ساختەکان.. دیاربوو کە بە تەنیا ناتوانم باری قورسی ئەو ڕێ سەختە هەڵبگرم. ڕۆژانی زۆر گران چاوەڕوانم بوون. ڕۆژانێک کە جارێک سەرم سووڕدەما و جارێك ئێرەییم دەبرد، تاوێك پەندم وەردەگرت و تاوێك شۆك دەبووم.

هیوام وایە کەس وەکو من لەم ژیانە پڕناسۆرەدا نەژی!

# بەشی دووەم

## یەکەم هەنگاو بەرەو
## نمایشکاریی جلوبەرگ



سالانی خوێندنی سەرەتاییم لە ماڵی باپیرمدا هاودەم لەگەڵ بێکەسی و دڵتەنگی بەسەربرد. نە نازم کێشرا و نە ئەوەی حەزم لێی بوو بۆم کرا. باپیرم دوای دوو ساڵ بە نەخۆشی گورچیلە کۆچی دوایی کرد. مامیشم ژنی هێنا. بووکی تازە منی لەو ماڵەدا نەدەویست.

تاقە هیوام پوورێکم بوو، ئەویش بە بووکی ڕۆیشت و تەنها نەنکمم بۆ مایەوە. بەڵام چونکە نەنکم لە دایکم تووڕەبوو، قەت نەچووە دڵمەوە و خۆشم نەویست.

لە چوار و پێنجی سەرەتاییدا مامۆستایەکی ئافرەتمان هەبوو بە ناوی مەرال. جلی کورت و ناجۆری دەپۆشی و زۆرجار قسەوباسی خراپیان دەربارەی دەکرد. چەندجارێك شووی کردبوو و تەڵاق درابوو.

زۆر لە من نزیك دەبووەوە. وابزانم خوا ئەو جوانییەی بە دایکمی دابوو بە منیشی بەخشیبوو. هەر فرسەتی بۆ هەڵبکەوتایە پێی دەوتم:" ئاخ خۆزگە ئەو جوانی و ناسکییەی تۆ بە منەوە دەبوو" !

زۆر هــەوڵی دا منــیش وەك خــۆی لــێ بكــات. تەنوورەكــەمی كــورت دەكــردەوە و قــژی دەبــڕیم و فێــری میكیــاژی دەكــردم. ڕۆژی دە جــار دەیوت:" تۆ حەتمەن دەبیت بە نمایشكاری جلوبەرگ".

كە باسی دایكم و مردنی هاتە ناوەوە، وتی:

– واز لەو بیركردنەوانە بێنە. دایكت مـردووە و تـەواو. هـەموو كەسـێك دەمرێت. بەڵام خۆ ناكرێت ئێمەی زینـدووش لەگـەڵ مردووانـدا بمـرین. تـۆ ژیانی خۆشی خۆت بژی. كچێكی لاوی جوان بهێنـە پـێش چـاوت. خـانووی جـوان، سـەیارەی جـوان و شـووكردنی جوان..كـارت چـییە بـە گـۆڕ و بـە مردووەوە. بۆ لە خۆڕایی تامی ژیان تاڵ دەكەیت؟

هێواش هێواش دەكەوتمە ژێر كاریگەری بیر و هەڵسوكەوتیەوە. جـاری وا هەبوو دەیبردمە ئەو خانووەوە كە بـە تـەنها تێیـدا دەمایـەوە و دەیـوت هاودەمیم بكە. زۆر نهێنی خۆیی لا دركاندبووم. ئـەو بابەتانـەی مـن پێیـان سوور هەڵدەگەڕام، ئەو زۆر ئاسایی باسی دەكردن.

دەیانوت شەوان درەنگ خەڵك هاموشۆی ئەو ماڵە دەكات. منیش خۆم چــەندجارێك هەنــدێك گــەنجم لــەوێ بینــی. جگــەرەی زۆری دەكێشــا و جارجاریش دەیخواردەوە. دنیای ئەو تەنها مۆسیقا و ڕابواردن و سەمابوو. لە بابەتی خوا و ئیماندا گاڵتەجاڕ و جوێنفرۆش بوو. دەیوت:" لەبری دوعـا فێری گۆرانی ببن و ڕابووێرن".

بەداخەوە ئەوبوو یەكەم پێكی شەرابی دایە دەستم و بـەزۆر كـردی بـە گەروومدا. ئەو مامۆستایەك بوو لە پۆلدا باسی زیانەكانی ئـارەقی دەكـرد و لە ماڵەوە دەیخواردەوە.

مامم ڕۆژێك بانگی كردم و وتی:

– مەچۆ بۆ ماڵی مامۆستا مەرال.

پاش ماوەیەك بۆمان دەركەوت كە تومەز بە پارە خۆی دەفرۆشێت. شەوێك پۆلیس دای بەسەر ماڵەكەیدا و گرتیان. جارێكی تر مامۆستا مەرالم نەدییەوە، وەلێ هەڵسوكەوتەكانی لە مێشكمدا جێی خۆیان كردبووەوە. چونكە پێی دەوتم كە زۆر جوانم و پێویستە ببم بە نمایشكاری جلوبەرگ و، ئەوكات ژیانێكی قەشەنگ و خۆشم دەبێت. ئەم بیرە كاری تێ كردبووم.

ئەو شتەی دەمویست. دەرچوونم لە تاقیكردنەوەی وەرگیرانی دواناوەندی لە شار و دووركەوتنەوە لە گوند بوو. چیتر نەبیستنی بۆڵە و سەرزەنشی نەنكم و، بینینی كەسانی تر و شوێنانی تر.. پاشان ڕێیەك بدۆزمەوە بۆ بوون بە نمایشكاری جلوبەرگ..

## دەمویست ببم بە نمایشكاریی جلوبەرگ:

كاری نمایشكاریی جلوبەرگ هێندە چووبووە دڵمەوە، بە ئارەزوویەكی منداڵانەوە نامەم بۆ ئەو ژنە ناودارانە دەنارد تا نهێنی سەركەوتنیان لەو كارەدا بدۆزمەوە. چونكە هەركەسێك دەیبینیم دەیوت كە كچێكی زۆر جوانی. ئەم ستایش و پیاهەڵدانانە ئەوەندەی تر حەزەكەمیان تۆختر كردەوە.

بەڕێوەبەری قوتابخانەكەمان یارمەتی دام خۆم ئامادە بكەم بۆ تاقیكردنەوەكان. ژنەكەیشی زۆر دەستگیرۆیی كردم. جلی بچوك بووەوەی منداڵەكانی خۆیان پێدەدام و جارویاریش هەندێك پارەیان دەخستە گیرفانەكەیەوە و دڵیان خۆش دەكردم. خێزانی بەڕێوەبەرەكەم هاوڕێی نزیكی دایكم بوو. هەردەم باسی دایكمی دەكرد.

لە كۆتاییدا لە تاقیكردنەوەكە دەرچووم. كە هەواڵەكەم بیست لە خۆشیدا خەریك بوو لەهۆش خۆم بچم. ئەو ساتە وامزانی هەموو خەیاڵەكانم هاتوونەتە دی. بەچیدا بمزانیایە ڕووبەڕووی سەختترین تاقیكردنەوەی

ژیانم دەکاتەوە و، تەڵەی بێبەزەییەکانم بۆ دەنێتەوە و تەنیا و بێکەسم دەکات لەسەر سفرەی گورگان؟

قوتابخانە نوێیەکەم دووربوو. دوای حەوت هەشت سەعات گەیشتین. مامم بردمی و دانیام. قوتابخانەکە بە گەورەیی و باخچەکەیی و پۆلەکانی و بەشی ناوخۆییەکەی سەرسامی کردم.

یاریدەدەری بەڕێوەبەر کە ئافرەتێك بوو، ناوی تۆمارکردم. وتی:

– ماشەڵا کچم چەند جوانیت! ئیشەڵا ئەم جوانییە تووشی بەڵات ناکات!

تێنەگەیشتم مەبەستی چییە. مەگەر دەکرێت جوانی کێشە بۆ مرۆڤ بنێتەوە؟ بەداخەوە وەختێك تێگەیشتم جوانی هەندێك جار ژیانی مرۆڤ لێڵ دەکات، کار لە کار ترازابوو.

وانەکان دەستیان پێکرد. هەر لە یەکەم وانەوە هەموو سەرنجەکان کەوتنە سەر من. هۆیەکەشی ئەوەبوو مامۆستای مۆسیقا، مامۆستا ئایلین، هەر هاتە ژوورەوە چاوی چووە سەر من و وتی:

– ئای چەند جوانیت، کچم!

هاتە لامەوە و هەڵیساندمە سەرپێ و بەدرێژایی وانەکە هەوڵی دەدا خۆیم لێ نزیك بکاتەوە. بەجۆرێك بوومە کەسێك کچە ناشیرینەکان ڕقیان لێم بێت و جوانەکان بەخیلیم پێ ببەن و کوڕەکان دەوروخولم بدەن.

ئیتر لێرەوە سوودپەرستان و دۆستانی ساختە و نیەت گڵاو، بەدرێژایی تەمەنم ڕیزیان بەست.

دوو مامۆستا لە پۆلدا کاریگەرییان هەبوو لەسەرم. مامۆستا ئایلین و، مامۆستا فەزیلەت.

مامۆستا ئایلین پشتگیری لە هاوچەرخی و سەربەستی و بێدینی دەکرد و دەیوت:" مرۆڤ تەنها ئەوکاتە خۆشبەخت دەبێت کە خۆی لە

بەندی دین ڕزگاربکات، ئەگینا دەبنە کۆیلەی یاسا ئایینییەکان و ژیانتان تاڵ دەکەن".

مامۆستا فەزیلەت ڕای وابوو کە باوەڕ بە خوا مەرجە بۆ ئاسوودەیی دەروونی و لێبووردەیی و کاری چاك لەنێوان مرۆڤەکاندا.

ئەم دوو مامۆستایە هەمیشە لە وانەکانیاندا نموونەیان دەهێنایەوە و هەوڵیان دەدا بیروباوەڕەکەیان بسەلمێنن. منیش لە نێوان ئەم دوو مامۆستایەدا دەهاتم و دەچووم. بەڵام کاریگەری مامۆستا ئایلین زۆرتربوو چونکە ئەو زیاتر پەسنی جوانییەکەمی دەدا و ستایشی دەکردم.

دوو ساڵ ئاوا بە ململانێ تێپەڕی. لەگەڵ گەورەبوونمدا بیرە شەیتانییەکانی ناوم و دەوروبەریشم گەورەدەبوون و نیلۆفەری تازە وردە وردە جێی بە نیلۆفەری کۆن لەقدەکرد.

کاتێك هاوینی ساڵی دووهەم گەڕامەوە بۆ لادێ زۆر شت گۆڕابوو. نەنکم مردبوو و مامم و ئامۆژنیشم لە بگرە و بەردەی تەڵاقدا بوون. واتە نەمدەتوانی بۆ ڕۆژێك لەو گوندەدا بمێنمەوە. هەموو ڕۆژێکم لەوێ ئەشکەنجەبوو. بەدڵ و بەگیان چاوەڕێی کرانەوەی قوتابخانەبووم.

چەند کەلوپەلێکی تایبەتی دایکمم لەگەڵ خۆم هەڵگرت و گەڕامەوە بۆ قوتابخانە. ئەوە دوا گەڕانەوەم بوو، ئیتر هەموو پەیوەندیەکانم بچڕاند.

## ئەوانەی هەوڵی خۆ لێنزیکردنەوەیان دەدام زۆربوون:

لە دواناوەندی و ئامادەییدا دەرگاکان کەوتنە سەرپشت بۆم. هەم وانەکانم باش بوون و هەم کەسانێکی زۆر گرنگیان پێدەدام.

بەڕێوەبەرێتی قوتابخانە لە هەموو بۆنەکاندا پێشکەشکاریی دەبەخشی بە من و هەر من ئەرکی پێشوازی گەورە پیاوانی دەوڵەت کە دەهاتن بۆ سەردانی شارەکە، وەردەگرت. جگە لەوەش قوتابخانە مووچەیەکی

یارمەتی بۆ بڕیبوومەوە. لە کۆتایی ساڵی خوێندندا چەند کۆمپانیایەک داوایان لێ کردم ببم بە سکرتێریان.

چیتر نیلۆفەری کۆن نەمابوو، نیلۆفەری تازە شانازی بەخۆیەوە دەکرد و لووتبەرزبوو. بەداخەوە جیاوازی نێوان ئەم دوو نیلۆفەرە تا دەهات زیاتر دەبوو. پەیوەندی نزیکم لەگەڵ ئایلین خان گشت بەها مەعنەوییەکانمی ڕووخاند.

منێك کە جاران خوا و پێغەمبەر و بەندایەتی و ئەجەلم لەیاد بوو، شەوان بەدەم دوعاوە دەنووستم، ئەوا نزیکەی ساڵێکە هەموو ئەوانەم لەبیر چوونەتەوە.

فەزیلەت خان لە وانەکانیدا پەیامی کاریگەری دەگەیاند و منی دەهەژاند و سەرلەنوێ هەستە جوان و باڵاکانی لە ناخمدا دەورووژاند. بەڵام هەر کە ئایلین خانم دەبینی لەبیرم دەچوونەوە.

جارێکیان لە وانەی مامۆستا فەزیلەت دا سەری گفتوگۆ دامەزرابوو. کۆمەڵێك کوڕ و کچی گاڵتەچی و خۆبەشتزان مامۆستایان دابووە بەر لێزمەی پرسیار. ئەو خوێندکارانەبوون کە بە نزیکییان لە مامۆستا ئایلین دەناسران. چەند هاوڕێیەکم دەیانوت کە ئەمانە ئایلین خان هانیان دەدات.

کوڕێك بە ناوی چاداش و کچێك بە ناوی نوورای دەمڕاستی ئەم گرووپە بوون. ئەمانە ماددەگەرا و دووربوون لە مەعنەویەت، لە پەیوەندی نێوان کچ و کوڕدا گوێیان بە هیچ بەهایەکی کۆمەڵایەتی نەدەدا.

کچێك بە ناوی خانم و کوڕێك بە ناوی سەیدا پشتگیرییان لە بۆچوونەکانی مامۆستا فەزیلەت دەکرد. بەتایبەتی سەیدا کە کوڕێکی بەڕەوشت و زیرەك و ژیر بوو.

هەرچەندە من لە هیچ یەکێك لەم گرووپانەدا نەبووم، وەلێ زیاتر لە ئایلین خان نزیك بووم.

# بەشی سێیەم

## ئەو گفتوگۆیەی هەرگیز لە یادم ناچێتەوە



گفتوگۆکەی ئەو ڕۆژە بە پرسیارێکی جاداش لە مامۆستا فەزیلەت دەستی پێکرد، بابەتەکەش وتوویژ بوو لەسەر ئەو بەرنامەیەی لەسەر بیردۆزی پەرەسەندن دوێنێ شەوەکەی لە تەلەفزیۆن نیشانی دابوو.

چاداش پرسیاری لە مامۆستا فەزیلەت کردو، وتی:

– مامۆستا، ئەو بەرنامەیەت بینی لەسەر بیردۆزی پەرەسەندن؟

– بەڵێ بینیم.

– کەوایە تێگەیشتیت کە مرۆڤ لە مەیمونەوە هاتووە؟

شێوازی پرسیارەکە بەئاشکرا گاڵتەجاڕی و سووکایەتی پێوە دیاربوو. بەڵام مامۆستا جددی و خۆڕاگربوو. وتی:

– کوڕم، پێش هەموو شتێك لەو بەرنامە تەلەفزیۆنییەدا نەگەیشتن بە وەها ئەنجامێك. بەپێچەوانەوە باس لەوە کرا کە بیردۆز ئەگەرێکە نەك ڕاستەقینە. واتە وترا کە بۆچوونێکە و بەڵگەی زانستی لەسەر نییە.

– بەڕای تۆ ئەگەر مرۆڤ لە مەیمون پەرەی سەندبێت چ زیانێکی تێدایە؟

– خوا بیویستایە مرۆڤی لە مەیمون دروست دەکرد، وەلێ ڕاستی ئەوەیە کە مرۆڤ لە مرۆڤ بووە. بڕوانە کوڕی شیرینم، داروینیزم، واتە بیردۆزی پەرەسەندن، ئایدۆلۆژیایەکی ساختە و هەڵبەستراوە. هیچ بەڵگەیەکی زانستی لەپشت نییە و ئامانج لێی بەرپەرچدانەوەی حەقیقەتی بەدیهێنانە، بەڵام نەیتوانیوە سەرکەوتوو ببێت. ئەم بیردۆزە پێی وایە گوایە زیندووان لە ئەنجامی ڕیزبوونی هەڕەمەکی ماددە بێگیانەکانەوە دروستبوون. بەڵام ئێمە بەدیهاتنی بوونەوەران لەوپەڕی جوانی و ڕازاوەیی دا و، بەهاناوەچوون و ئاگاداری لێ کردنیان لەوپەڕی قەشەنگیدا و، پاراستنیان لەوپەڕی میهرەبانیدا دەبینین، ئەمانە کۆمەڵێك فرمانن کە هەم زانست و هەم توانستی بێ سنووریان دەوێت، کە ئەمەش دیارە لە ماددەی کوێر و کەڕ و بێگیاندا نییە.

– کەواتە تۆ پەرەسەندن قبووڵ ناکەیت؟

– بڕوانە چاداش گیان، خوا باشتر دەزانێت. بەدیهێنەری بوونەوەران لەبارەی بەدیهێنانەوە هەموو شتێکی لە قورئانی پیرۆزدا فەرمووە.

– چی دەڵێت قورئانی پیرۆز؟

چاداش ئەم پرسیارەشی بە پێکەنین و گاڵتەوە کرد. مەبەستی ئەوە نەبوو زانیاری وەربگرێت، بەڵکو دەیویست بە مامۆستا ڕابوێرێت. بەڵام فەزیلەت خان چاوی نووقاند لە هەڵسوکەوتی بەدی چاداش و دەیزانی کە ئەگەر ئەو گوێش نەگرێت دەبێت، وەلێ کەسانێکی تر هەن لە پۆلەکەدا تامەزرۆی وەڵامی پرسیارەکەن. بەردەوام بوو لەسەر وتەکانی و وتی:

– حەزرەتی ئادەم یەکەم مرۆڤە. چەندەها ئایەت هەیە پێمان دەڵێت کە حەزرەتی ئادەم لە گڵ دروستبووە. ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَٰجًا ۚ وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴾ فاطر: ١١، واتە: "خوا بنەچەی ئێوەی لە

گڵ دروست کردووە و پاش ئەوە کە ئادەمی لە گڵ دروست کرد ئەولاد و نەوەی ئەوی لە تۆمێك دروست کرد کە لە پشتی باوکەوە دەچێتە مندالّدانی دایك."

لە دروستبوونی یەکەم مرۆڤیشدا هەمان ئەو قۆناغانە بوونیان هەبووە کە لە بەدیهاتنی مرۆڤی ئەمڕۆدا هەن. ﴿ ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥۖ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ مِن طِينٖ ﴾ السجدة: ٧، واتە: "ئەو خودایەیە هەر شتێکی دروست کردووە باشی دروست کردووە و بەپێی حیکمەتێك دروستی کردووە و سەرەتای دروست کردنی ئادەمیزادی لە گڵەوە دەست پێ کردووە."

لەم ئایەتەشدا باس لە چییەتی ئەم قوڕە دەکرێت: ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴾ الحجر: ٢٦ ، واتە: " بەڕاستی ئادەمیزادمان لە قوڕێکی وشك دروست کردووە کە دەستی لێ بدەیت دەنگی لێوە دێت، ئەو قوڕەش لە قوڕێکی ڕەشی ڕەنگ گۆڕاوی لەقاڵبدراوە."

لەم ئایەتە پیرۆزانەوە تێدەگەین کە ئافراندن بە گڵ دەستی پێکردووە و پاشان شکڵی قوڕی وەرگرتووە. ئەم قوڕەش پاڵێوراوە و پوختەیەکی لێ هەڵبــژێرراوە. ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ ﴾ المؤمنــون: ١٢ ، واتــە:" بەڕستی ئێمە ئادەمیزادمان لە پوختەیەك لە قوڕ دروست کردووە."

پاشان ئەم قوڕە پوختەکراوە شکڵێکی تازەی وەرگرتوە.

﴿ قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴾ الحجــر: ٣٣، واتــە:" ئیبلـیس وتــی: ڕەوا نییــە مــن کڕنــووش بـۆ بەشــەرێ بــەرم لــە خــاکێکی ئاوازەداری سیاڕەنگ دروست کرابێت."

هــەموو پێکهاتنــەکان تــا ئــەم قۆناغــە لــەو گۆڕانکارییانــە دەچــن کــە کۆرپەلەی ئەم سەردەمە لە (١٢٠) ڕۆژی یەکەمیدا پێیدا تێپەڕدەبێت.

هەروەك چۆن ئەو خواردنانەی لە دەرەوە وەری دەگرین گەدە هەرسی دەكات و دەینێرێت بۆ خانەكان و، بۆ دروستبوونی هەر ئەندامێك ئەو ماددانە بەكاردێن كە پێویستن، بەهەمان شێوەش تۆو و هێلكەی مرۆڤ لە هەمان خۆراكی ناو گەدەوە پوختە دەكرێن و بەدیدەهێنرێن. واتە وەك دروستكردنی قوڕی پوختە لە قوڕ، و پاشان بەدیهێنانی قوڕێكی ڕەقەوەبوو لێی، ئنجا دوای ئەمە شكڵی مرۆڤ دەبەخشرێت بەو پێكهاتەیە.

هەروەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ﴾ الأعراف: ١١، واتە: " بەڕاستی ئێمە باپیرە گەورەی ئێوەمان دروست كردو، شێوەی بنیادەممان پێدا. پاشان وتمان بە فریشتەكان: سوجدەی ئیحتیرام بەرن بۆ ئادەم، ئەوانیش هەموویان سوجدەیان بۆبرد، ئیبلیس نەبێ كەسەرپێچی كردو سوجدەی نەبرد."

لە سوورەتی نوحیشدا ئاماژە بە بەدیهێنانی یەكەم مرۆڤ و پلە بە پلە بەدیهێنانی ڕەگەزی مرۆڤ دەكرێت.﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾ نوح: ١٤، واتە: " كە خوایش ئێوەی دروست كردووە و بە چەند قۆناغدا تێیپەڕاندوون.)"

دەتوانرێت بوترێت تا ئەم قۆناغە مرۆڤ هاوشێوەیە لەگەڵ ڕووەك و ئاژەڵەكانی تر لە گەورەبوون و پەرەسەندندا و هەموویان پابەندن بە یەك یاساوە. بەڵام لێرە بەدواوە بەدیهێنانێكی نوێ ڕوودەدات لە كۆرپەلەی مرۆڤدا. واتە ڕۆح دەچێتە جەستەوە. چونكە تا ئێرە پێكهاتەی ماددی مرۆڤ تەواوبووە.﴿ ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ المؤمنون: ١٤ ، واتە: " پاش ئەوە ئەو تۆمەمان كرد بە پارچەیێ خوێن، پاشان ئەو پارچە خوێنەمان كرد بە پارچە گۆشتێ، پاش ئەوە ئەو

پارچە گۆشتەمان کرد بە ئێسقان، ئەوجا گۆشتمان کردە بەری پارچە ئێسقانەکە، ئەوجا کردمان بە دروستکراوێکی تر کە ئەو منداڵەیە لە منداڵدانی دایکی دێتە دەرەوەو لەدایك ئەبێ، ماشەڵڵا چەند گەورەو پیرۆزە خوا کە جوانترین دروستکەرێکە بە خەیاڵی ئادەمیزادا بێت. "

﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾ ص: ٧، واتە: "جا کاتێك دروستم کرد و بە فووی ئەو فریشتەیەی ئەو کارەی پێ سپێرراوە لە گیانی خۆمم کرد بە بەرا، ڕوو لەسەر زەوی بکەون و سوجدەی بۆ بەرن."

لەم ئایەتە پیرۆزەشدا ئاماژە بە گشت قۆناغەکانی خوڵقاندن دەکرێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴾ الحج: ٥، واتە: " خەڵکینە! ئەگەر ئێوە گومانتان لە زیندووبوونەوەی خۆتان لە ڕۆژی قیامەتدا هەیە چاری ئەو گومان و دوودڵییەتان بەوە بکەن ورد ببنەوە، من ئێوەم لە گڵ دروست کردووە چونکە باوکە گەورەی ئادەمیزاد کە ئادەمە لە گڵ دروست کراوە، لەوەپاش لە تۆوی باوك و دایك دروستم کردوون، ئەمجا لە پارچە خوێنێکم دروست کردوون، ئەمجا لە پارچە گۆشتێکم دروست کردوون، هەیەتی خراوەتە شێوەی ئادەمیزادەوە و هەیەتی نەخراوەتە شێوەی ئادەمیزادەوە، ئەمەتان بۆیە بۆ باس ئەکەم تا بزانن چۆنم دروست کردوون. ئێمە چیمان بوێت لە کوڕ و لە کچ لە منداڵدانی ئافرەتدا دادەنێین

تا وادەی دیاریکراوی خۆی ئەمجا بە منداڵی لە سکی دایکتان ئەهێنینە دەرەوە..."[1]

ئەو قۆناغانەی کۆرپەلە پیایاندا تێپەڕدەبێت و ئەم ئایەتە باسیان دەکات، هەمان ئەو قۆناغانەن کە کۆرپەلەی ئەم ڕۆژگارەش پەیڕەوییان لێ دەکات.

داهێنەری ئامێرێك لە کەتەلۆگەکەیدا ئەوەی دیاری کردووە کە ئەم ئامێرە چۆن کاردەکات و پێویستە چۆن بەکارببرێت. بۆ نموونە لە کەتەلۆگی ڕێنمایی ئامێرێکدا نووسراوە کە بە (٢٢٠) ڤۆڵت کاردەکات، گەر ئێمە لە خۆمانەوە (٥٠٠) ڤۆڵتی بدەینێو وابزانین باشتر کاردەکات، دیارە لەم کاتەدا چی بەسەر ئامێرەکەدا دێت. !

بەهەمان جۆر جەستەی مرۆڤیش ئامێرێکی ناوازە و پێکهاتەیەکی نایابی دەستی توانستی خوای گەورەیە. بێگومان بەدیهێنەر لە هەموو کەس باشتر دەزانێت ئەم ئامێرە چۆن کاردەکات. مادەم خوای گەورە دروستی کردووین و پێشی ڕاگەیاندووین کە چۆن بژین، کەواتە ئەوەی لەسەر ئێمەیە گوێڕایەڵی و جێبەجێکردنە.

— واتە تۆ لەم سەردەمی زانست و پێشکەوتنەدا دەڵێیت خوا هەیە؟

ئەم پرسیارەشی بۆ لاقرتێ و بە تۆنێکی گاڵتەجاڕانەوە پرسی. ئەمجارەیان سەیدا خۆی پێنەگیرا و هەستایە سەرپێ و وتی:

— پرسیار و وەڵام و گفتوگۆش یاسا و ڕەوشتی خۆی هەیە براکەم! ئەوەی تۆ دەیکەیت بەئاشکرا سووکایەتییە.

مامۆستا فەزیلەت خێرا کەوتە خۆی و، دۆخە گرژەکەی هێورکردەوە و، چاداش و سەیداشی بێدەنگ کرد.

---

١- تەفسیری کوردی ئایەتە پیرۆزەکان لە (خۆلاصەی تەفسیری نامی) ی مامۆستا عبدالکریمی مدرس وەرگیراوە.

## هەرگیز وتارێکی ئاوام نەبیستبوو:

دوای ئەوە مامۆستا فەزیلەت کەوتە باسێکی زۆر خۆش. ڕاستیەکەی سالانێك بوو گوێم لە وتاری وا کاریگەر و بەچێژ نەبووبوو. بیرمە وتی:

– منداڵان بە بێتاوانی دێنە دنیا. بەئاسانی لە ڕوخساری پاکیاندا ئەمە دەبینرێت. ئەم بێگوناهییە تا تەمەنی باڵغبوون درێژەی هەیە. ئیتر لەم تەمەنەوە بەرپرسیارێتی دەکەوێتە سەرشانیان. مرۆڤ لەگەڵ تاواندا ڕووبەڕوو دەبێتەوە. خوای گەورە دڵی مرۆڤی وا دروستکردووە کە لە گوناه بێزارە. کەسێك بۆ یەکەمجار درۆیکات یان ئارەق بخواتەوە لە دڵەوە نیگەران دەبێت. بەڵام لەگەڵ بەردەوامبوونی سەرپێچیدا دڵ هەستیاری خۆی لەدەست دەدات. وەکو چۆن ئامێرێکی هەستیار گەر تۆز بچێتە ناویەوە لەکاردەکەوێت، مرۆڤیش کە ئامێرێکی زیندووی دەراسایە بە تۆزی گوناه لەڕووی مەعنەوییەوە پەکیدەکەوێت. دڵی مرۆڤ کە لە سەرەتادا وەك ئاوێنەیەکی پاك و ڕۆشن وایە، بە چڵکی تاوان بێگەردی خۆی لەدەست دەدات.

گوناه و تاوان پێچەوانەی سروشت و فیترەتی مرۆڤە و، جووڵانەوەیە بەپێچەوانەی فەرمانی خودا. گوڵەبەڕۆژە بەتازەیی هەردەم ڕووی لە خۆرە. بەڵام کە سەری قورس بوو، ئیتر ڕوو ناکاتە ئاسمان و ڕووانینەکانی لە زەوی دەچەقن. ئەوانەی لەسەر تاوان بەردەوامن ئەمە حاڵیانە. ڕوو ناکەنە شتە مەزن و بەرزەکان و شەیدای نزمی و پەستین. گەورەیی و فراوانی نازانن و لە سادەیی و بچووکیدا دەخنکێن. کە تۆزی سەرپێچی نیشت لەسەر باڵەکانیان ئیتر ناتوانن لە ئاسمانی حەقیقەتدا بفڕن.

قورئانی پیرۆز سەبارەت بە گوناه دەفەرمووێت:" تاوانباران بە ڕووخسارياندا دەناسرێنەوە".

ئەم ئایەتە باسی سەرنشینانی دۆزەخ لە حەشردا دەکات. لەو ڕۆژەدا باوەڕداران بە سیمای نوورانی و، گوناهباران بە ڕووخساری ڕەشیاندا دەناسرێنەوە. ئایەتەکە ئاماژەیەکیشی تێدایە بۆ ژیانی دنیا. بەڵێ، بێباوەڕان لە دنیاشدا سیمایان دیارە. بێگومان ئەو نێوچەوانانەی کە هەمیشە لە سوجدەدان و ئەوانەی دانەنەوینەتەوە بۆ سوجدە هەرگیز وەك یەك نین. کەسێك بینایی دڵی ڕۆشن بێت ئەم دووانە لەیەك جیادەکاتەوە.

بەڵام پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێت کە لەوانەیە گوناهکاری دوێنێ، ئەمڕۆ مرۆڤێکی باش بێت. پیسی و چەپەڵی تاوان بە تەوبە پاکدەبێتەوە. ئەو دواکەوتنەی هانی دەدات زۆرتر و زیاتر هەوڵی پێشکەوتن بدات. پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێت) کە دەستی کرد بە گەیاندنی پەیامەکەی، زۆربەی زۆری ئەوانەی باوەڕیان پێ دەهێنا گوناهکاربوون. بەڵام هەر ئەوەندەی نیعمەتی ئیمانیان پێگەیشت، ئەو مرۆڤە مەزنانە لاپەڕەی ڕەشی ڕابردوویان داخست و ژیانێکی پاك و بێگەردیان هەڵبژارد. تا ئەوەی بوونە مایەی شانازی مرۆڤایەتی.

کەواتە لەم وانەیەوە پێویستە ئەوە فێرببین کە خوای گەورە هەموو شتێکی خستۆتە بەردەست چاکەکاران و خراپەکارانیش تا لە ڕۆژی دواییدا لێپرسینەوە دادگەرانەبێت. بەڵام گوناه ڕۆح چەپەڵ دەکات و دڵ دەمرێنێت و ڕەوشت لاواز دەکات.

## بڕوای بە ڕۆح نەبوو:

چاداش هەڵیدایە و وتی:

– ڕۆح دەڵێیت مامۆستا؟

– بەڵێ ڕۆڵە گیان ڕۆحم وت. هەموو مرۆڤێك ڕۆحێکی هەیە.

– ئەم ڕۆحە چییە ؟ تۆ قەت دیوتە؟

ئەم پرسیارەشی بۆ گاڵتەکردن و قۆشمەچێتی کرد. بەڵام مامۆستا زۆر لەوە وریاتر و ژیرتربوو تووڕە ببێت، بۆیە تەنها بە زەردەخەنەیەك وەڵامی دایەوە و بەردەوام بوو لەسەر وتەکانی:

– مرۆڤ لەڕووی جەستەیی‌یەوە ناوازەیە و لەڕووی مەعنەوی و ڕۆحیشەوە بەدیهاتوویەکی نایابە. ئەو خوایەی چاو و گوێ و دەست و قاچی داوەتە لەش، هەست و حەزی فێربوون و خۆشەویستی و ترسیشی بەخشیوەتە ڕۆح. ناکرێت ئەم هەستانە بگەڕێنینەوە بۆ مادده. بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤ حەزی فێربوونی نەبووایە زانستەکان پەیدا نەدەبوون. ئاژەڵان کە حەز و شەوقی فێربوونیان نییە لەو ڕۆژەوەی دروستکراون نەبینراوە شتێك دابهێنن و زانستێك بدۆزنەوە. مەیدانی ئەوان زۆر تەسك و سنووردارە. بۆ نموونە ئەو ئاژەڵانەی گیا دەخۆن تەنها گرنگی بە سەوزایی دەدەن. وەلێ مرۆڤ کاتێك لەسەر پێیەکانی بە زەویدا دەڕوات، بە ژیری و خەیاڵ لە ئاسماندا مەلە دەکات، تەنانەت گەردوونیش بۆی بچووکە. هەموو ئەمانە نیشانمان دەدەن کە باوەڕ بە خوا گومانەکانی ژیری مرۆڤ لەناودەبات، بەڵام گەر ئەم ئیمانە نەبێت دنیایەك گومان و ناڕوونی ڕووی تێدەکات و ژیانی لێ تاڵ دەکات.

لەسەر کۆتا دێڕەکانی فەزیلەت خان چاداش خەریك بوو دەتەقیەوە، لەڕاستیشدا لە بەرامبەر ئەو لێکدانەوە دروستەی ئەنجام درابوو کە کاریگەری لەسەر هەموو پۆلەکە دروست کردبوو، ئەویش بەرگەی نەدەگرت.

## ئەو دیمەنەی هەمووانی سەرسام دەکرد:

هەستایە سەرپێ و بە ڕەفتارێکی دوور لە ڕەوشتەوە دەستەکانی بەرزکردەوە و وتی:

- که تۆ ئاوایت.. خوا هەر بۆ تۆ. من دەردێکی ئاوام نیە. ئادەی خوا بانگ بکە بۆ ئێرە، بابێت و سزام بدات. من باوەڕم پێی نیە چی دەکات با بیکات لێم..

من ئاگادارت دەکەمەوە ئەگەر جارێکی تر لەم پۆلەدا باسی خودا و لێکدانەوە دینیەکانت بکەیت ئەوە بزانە کە لە دەستی من ڕزگارت نابێ..

من هەر لێرە دەبم، ڕێگەی دەربازبوون بە خۆت و خواکەشت نادەم....

بەجۆرێك بە دەستەواژەی نەشیاو و قورس و بە دەمدا نەهاتوو بەڕووی فەزیلەت خاندا هەڵپژا کە هەموو پۆلەکە بە مەستی ڕامابوون.

ئەمە ئەوەی نیشان دەدا کە نەیدەویست ڕاستەقینە پەسەند بکات.

لە خواوە بوو کە سەیداش وەڵامی چاداشی نەدایەوە.

ڕەنگیشە بیری کردبێتەوە، بەم جۆرە ڕەفتارە ئەمە هەرگیز تێناگات. چونکە چاداش بەم حاڵەی لە پۆلەکەدا گەورەترین وەڵام و نیشانەی وەردەگرت. بێگومان وەڵامێکی پڕ لە تووڕەیی و نەفرەت ، نیشانەیەکی سفر و خاڵی.

بەتەواوی لەم کاتەدا بوو کە چاداش لە هاوارو نەڕەی خۆی لە هۆش خۆی چوو و بەسەر کورسیەکاندا کەوت. سەرسامییەکی زۆر پۆلەکەی داپۆشی سەرەڕای ئەوەی کە مامۆستاشمان لەلا بوو سەرمان سوڕمابوو کە چی بکەین.

بەپەلە چاداشیان گەیاندە نەخۆشخانە، هەواڵەکەش زۆر تۆقێنەر بوو هەموو کەسی سەرسوڕماو و حەیران دەکرد. وانەو پەندی زۆر گەورەی دەبەخشی.

چاداش مردبوو.. ئای خوایە گیان ئەوە چ بارێك بوو! ئەمە چ حاڵەتێکی بە ئەقڵ هەڵنەگیراو بوو. چ ڕاستەقینەیەکی باوەڕپێنەکراو بوو.

ئەو چاداشەی پڕ بە دەنگ و ئاوازی خۆی هاواری دەکرد " ئادەی خواکەت بانگ بکە بۆ ئێرە با سزام بدا.."..ئەمە زۆری بەسەردا تێپەڕی کە بە مردن خاڵی لە کۆتایی ژیانی خۆیدا دانا.

بەداخەوە ئەم ڕووداوە بە پێچەوانە لێکدرایەوە . سەرەڕای بێ تاوانی فەزیلەت خان سەرەتا نێردرایە خوێندنگەیەکی تر دواتریش بەگوێرەی ئەوەی کە بیستم لەکار لابرا بوو.

لەو ڕووداوەی چاداشدا کە سەیدا هیچ تاوانێکیشی نەبوو، بەڵام ئەویش سزا درا.

ئیتر هەموو مەیدانەکە بە چۆڵی بۆ مامۆستا ئایلن مابویەوە. هیچ کەس ئەوی نەدەوەستاند و قسەکانی نەدەبڕی. بەڕادەیەك بە نەفرەت و ئۆف کردنەوە هێرشی قورس و ڕووبەڕووبونەوەی ناپەسەندی لە بەرامبەر دین و دیندارەکان دەنواند.

ڕۆژەکانمان لەلایەك بە دەستاو دەستی بێ دینییەوە لەلایەکی تریش بە دۆستایەتیە ساختەکان کە لە من نزیك دەبوونەوە تێدەپەڕی.

لەو ڕووداوە بێ ئاگا بووم کە ژیانم پەرتەوازە دەکات. بە جوانیەکەی خۆمەوە لەناو مەیدانی گرنگی پێدانـدا خۆمم دەبینیەوە. کەسەکانی دەوروبەریشم گورگی برسی و کەسانی خاوەن ئەزموون بوون لە فرۆشتنی گۆشتی مرۆڤدا.

## بە شاجوان هەڵبژێردرام:

دواناوەندیم تەواوکرد بەڵام نەچوومە زانکۆ. چونکە لە پێشبڕکێی جوانی گۆڤارێکدا بە شاجوان هەڵبژێررابووم و ناوبانگم دەرکردبوو. ئەو پێشنیاری کار و پارە زۆرانەی خرانە بەردەستم تووشی لەخۆبایی بوونیان کردم، هەر لە نمایشکاری جلوبەرگ و بەرنامەی تەلەفزیۆنیەوە تا سکرتێریی کۆمپانیا گەورەکان، ڕیزیان بەستبوو.

شۆرەت و ناودەرکردن بەزوویی دەرگای خۆی لێ کردمەوە و منی بێ ئەزموونی خستە داوی خۆیەوە. کەسێکیشم نەبوو ئاگای لێم بێت و ڕێی ڕاستم نیشان بدات.

گەنج و جوان و بێئەزموون بووم. لە ماوەیەکی کورتدا شتانێکم دەست کەوت کە پێشتر نەمدەتوانی بیریشیان لێ بکەمەوە. پارە زۆر و زەبەندبوو. دنیا بە هەموو جوانییەکانیەوە مەستی کردبووم. وام هەست دەکرد کە بەسەر هەورەکانەوەم. ناوبانگ ئەوەندە دڵمی داگیرکردبوو، دەمێك بوو دین و ئیمان و شەرەفم لەبیرچووبووەوە. خۆ ئەگەر بشمویستایە نەمدەتوانی لە وەها دونیایەکدا پارێزگارییان لێبکەم.

چۆن ئەو ڕۆژە ڕەشەم لەیاد دەچێتەوە؟ چۆن ئەوتەڵە نەعلەتییە لەبیر بکەم کە سووتاندمی و دنیای ڕووخاندم و هەموو شتێکی لێ ڕفاندم؟ بڕیار وابوو پیاوێکی دەوڵەمەند لەگەڵ ستافێکدا بۆ کارێك بمنێرێت بۆ ئەورووپا. بۆ ئەو مەبەستە پارەیەکی زۆری دامێ. شەوەکەی لە ئوتێلێك میوانداری لێ کردم. منی بێمێشك وەختێك هاتمەوە هۆش خۆم تروسکەی هیوام کوژابووەوە و پاکیزەییان بردبووم. منێك کە کچی شەهید بووم، چۆن خۆم تووشی ئەو بەدبەختییە کرد؟

قیژاندم و کردم بە هەرا. قژی خۆم ڕنییەوە و لە خۆم دا. بەڵام پیاوی چڵێس دەتوت نە بای دیوە و نە بۆران. لەسەرخۆ وتی:

– کچی جوان، تۆ لە چ سەردەمێکدا دەژیت؟ باسی کچ و ژن و شتی وا نەماوە. ئەوانە ڕابردوو بوون. تۆ ژیانێکی خۆش بژی. چیت داوە بەسەر ئەو ترەهاتانەوە؟ باوی ناموس و حەیا نەماوە. بەناوی ئەمانەوە خەڵك دەخەڵەتێنن.

ئەم مرۆڤانەی کە بە ڕووکار دۆست دەنوێنن، لەڕاستیدا لە ناوەوە جانەوەرن. ئەستەم بوو ڕزگار بوون لە دەست ئەم گورگانەی کە بەرگی

مەریان پۆشیوە. بەس خۆی نەبوو، دنیایەك پیاوی چەكداریشی لەگەڵدابوو. وتی:

– بەیانی بە فرۆكەیەك دەتنێرم بۆ فەرەنسا. منیش دوای ڕۆژێك دێم. لەوێ ستافێك پێشوازیت لێ دەكەن. دوای كارەكە پێكەوە دەگەڕێینەوە.

ناچاربووم. شكاتی كێم لە كێ بكردایە؟ جوانییەكەم لێم بووبووە بەڵا. خۆزگە ناشیرین بوومایە و، سادە بەڵام ئازاد بژیمایە. ئەوكاتە ڕزگارم دەبوو لە داو و حەزی چڵێسی خەڵكی.

## كە سەیدام بینی شەرمەزاربووم:

سواری فرۆكەبووم. پاش كەمێك بینیم سەیداش لەناو فرۆكەكەدایە و بەرەو ڕووی من دێت. ئافرەتێكی داپۆشراوی جوانیشی لەگەڵدابوو. لەو ڕیزەی من دانیشتن. ئای خوایەگیان! دڵم بەپەلە لێی دەدا. تەریق بوومەوە. ڕووخسارم سوور هەڵگەڕا.

ڕاستیەكەی زۆرجار بیرم لە سەیدا كردبووەوە. بەڵام ئەو زۆر لەوە ژیرتر بوو ڕوو بدات بە كچی بێ سەروبەری وەك ئێمەمانان. وتی:

– چۆنیت نیلۆفەر؟ ئەمەش خێزانمە..

وتی كە هەردووكیان لە فەرەنسا لە كۆلێجی پزیشكی دەخوێنن. دڵم زۆر تەنگ بوو. ئەوان لە شەرم و شكۆ و ڕێزدا جوانترین و خۆشترین ژیان دەژین. ئەی من؟ نیلۆفەری شای جوانان؟ ئەو ئیتر گوناهكارێك بوو لەپێناو جوانی دەرەوەیدا جوانی ناوەوەی فرۆشتبوو. بەخیلی زۆرم برد بە ژنەكەی سەیدا. ئامادەبووم هەموو شتێكم بدەم بۆ ئەوەی لە جێگەكەی ئەو بوومایە. بەڵام هەزار حەیف! هەزار و یەك لەعنەت و جوێنم نارد بۆ ئەو مامۆستایانەی منیان بەم ژیانە گەیاند.

نزیكەی دوو مانگ لە چەندەها شوێنی جیاوازی ئەورووپادا پێشكەشكاری سیمیناری كۆمپانیاكەمان بووم. پارەی زۆرم دەست كەوت

و بوومە هۆی ئەوەی کۆمپانیاش قازانجێکی بێشومار بکات. بەڵام ئەمانە چ مانایەکیان هەیە؟ تێری سک چی بکات لە برسێتی و دارمانی ڕۆح؟ دڵخۆشی و ئاسوودەییم نەبوو.

کاتێک ڕووی ڕاستەقینەی ئەو ئەورووپایەم بینی کە خەڵک لەسەر زمانیان ناکەوێتە خوار، تووشی شۆک بووم. چەمکەکانی وەک دۆستایەتی و خۆشەویستی و ڕێز و خێزان مانای خۆیان ونکردبوو. سیستم و پارە و مافە کۆمەڵایەتییەکانی هەبوو، وەلێ ڕۆح و مرۆڤایەتی و خۆشەویستی خەریکبوون وشکیان دەکرد.

ماڵان وەک ئوتێلیان لێ هاتووە. یەکبوون لە خێزانەکاندا نییە. هەرکەسە و ژیانی خۆی دەژی و نامۆ بوون بە یەکتری. لەوێ ڕووداوێکم بینی و نرخی تەنانەت شپرزەترین خێزانی لای خۆمانم بۆ دەرکەوت.

سەردانی ماڵێکمان کرد. وەختێک کچەکەیان گەیشتووەتە هەژدە ساڵ، دایکی پێی وتووە:" ئیتر شوێنێک بۆ خۆت بدۆزەرەوە. چیتر ناتوانیت لێرە بژیت. گەورە بوویت و پێویستە خۆت خۆت بژیەنیت".

کچەی داماو لە ماڵ دەرچووە و هەوڵی داوە کارێک پەیدابکات و ژیانێکی نوێ دابمەزرێنێت، بەڵام سەری نەگرتووە و هاتووەتەوە ماڵەوە. دایکی پێی وتووە:" ژوورێکت بەکرێ دەدەمێ. چیت خوارد دەبێت پارەکەی دانێیت. حەزدەکەیت لێرە بمێنەرەوە، ناتەوێت بڕۆ شوێنێکی تر بدۆزەرەوە"!

کە ئەمەم بیست لەرز دایگرتم. باوکان و دایکانی خۆمانم بیرکەوتەوە کە ئامادەن لەبەر ڕۆڵەکانیان گیان بەخت بکەن. داپیرەکان هاتنە پێش چاوم کە لەبەر کوڕەزا و کچەزاکانیان خەو لە چاویان دەتۆرێت. بیرم لەو خوشک و برا گەورانە کردەوە کە ژیانیان بۆ برا و خوشکە بچووکەکانیان تەرخان دەکەن. کەوایە ئەمەبوو ڕووی ڕاستەقینەی ئەورووپای مۆدێرن!

ئامادەم لە دێیەکی بێ ئاو و بێ ڕێگای ئەنادۆڵدا کە خەڵکەکەی دڵیان پڕە لە خۆشەویستی، تەمەنێك بەرمە سەر نەك لە مەملەکەتێکی ئاوا مۆدێرندا کە مرۆڤایەتی تێدا نەماوە. بە خەیاڵ شکاوییەوە لە ئەورووپا گەڕامەوە. بەڵام ئەو خیانەت و دووڕوویی و گوناهەی ناو ئێمە تا دەهات پتردەبوو.

## ڕاوچیانی مرۆڤ هەموو شتێکیان پیس کردم:

تاجی شاجوانیی ڕۆحی کوشتم و ناخی بەتاڵ کردمەوە و باوەڕەکەمی ڕووخاند، لەبری ئەوەی بەختەوەری و ئاسوودەییم بۆ بهێنێت. چوار ساڵی ڕێك دەوڵەمەندان و پارەداران و ڕاوچیانی مرۆڤ و تەڵەکەبازان و گورگانی برسی، بووبوونە پەروانەی دەورم. ئیتر کەسێتی و پاکیزەییم لەکەداربوو و کەوتە ژێرپێ.

لەو ساڵانەدا ڕووداوگەلێکی پڕ پەند و عیبرەتم بەسەرهات. یەکێك لەوانە ئەوەبوو تێوەگلابووم لەگەڵ گروپێکی چەتە و مافیادا. ئەم گروپە منیان وەکو قولاپ بەکارهێنابوو لە کارە پیسەکانیاندا. دووجار لەسەر ماددەی هۆشبەر چوومە زیندانەوە. چەندجارێکیش پۆلیس لەسەر مەسەلەی ڕەوشت لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کردم. ئەمانە هێندە کەسێتییان ڕووشاندم نەفرەتم لە خۆم دەکرد.

لەو ساڵانەدا گەنجێکی پاك داوای کردم. شۆفێری سەیارەکەم بوو. کوڕێکی باش و سەڕاست بوو. بڕیارمان دا هەڵبێین. دەمووت بەشکم ببێتە هۆیەك و لەو هەموو نەگریسییە ڕزگارم ببێت. نازانم لەکوێوە پێیان زانی و گوێیان لێبوو. هەر لە ئەستەمبوڵ دەرچووین گەیشتنە سەرمان. بە قژ کێشیان کردم و زۆریان ئەشکەنجە دام. دڕندانە کوڕە هەژارەکەیان لەپێش چاوم کوشت. هەرکاتێك بیرم بکەوێتەوە دڵم دەگوشرێت و فرمێسك دەڕژێتە چاوم.

کاتێك دەڕوانمە تاوانەکانم و دەبینم کچی باوکێکی شەهید و دایکێکی پاك و بێگەردم، قێزم لە خۆم دێتەوە.

ڕووداوێکی سەیری تریش لە مزگەوتی سوڵتان ئەحمەد بەسەرم هات. یەکشەممەیەك بۆ ئەوەی تۆزێك دووربکەومەوە لەو دنیا تاریك و چڵکنە و کەمێك هەوای مەعنەوی هەڵبمژم کە زۆر بیرم دەکرد، بە شەرم و ڕووزەردییەوە چوومە مزگەوتی سوڵتان ئەحمەد. دەمویست دوعا و نزا تاقیبکەمەوە. بڕیارم دا بچمە حزووری ئیلاهی و داوای پاکبوونەوەی لێ بکەم. مزگەوتەکە قەرەباڵغ بوو. خەڵکی وەك فریشتەی پاك ڕوویان کردبووە خوای خۆیان و ڕاز و نیازیان دەگۆڕییەوە و بەکوڵ دەپاڕانەوە. ئەی من؟ من دەبوو چی بکەم؟ بە چ ڕوویەکەوە داوای لێخۆشبوون بکەم؟

هەر لەوێدا کەوتمە سەر ئەژنۆ، وەك ئەوەی بمەوێت لە مرۆڤەکان ڕابکەم و لەناو خۆمدا ون ببم. دەستم گرت بە دەموچاومەوە و کەوتمە گریان. نازانم چەندێك ناڵاندم و نووزاندم و هەنسکم دا.

یەکێك شانی ڕاوەشاندم. ئاوڕم دایەوە. ژنێکی تەمەن مامناوەندی داپۆشراوبوو. وتی:

– تۆ ئەو نیلۆفەرە بەناوبانگەیت؟

برۆکانی گرژ و تووڕەبوو. بە ترس و شپرزەییەوە وتم:

– بەڵێ ئەوم.

هێندە بە خەشم و قینەوە لێی ڕوانیم وەختبوو دڵم بوەستێت. پشتی تێ کردم و ڕۆیشت، وەك ئەوەی بڵێت:" تۆ لێرە کارت چیە؟"

هەرچۆنێك بوو خۆم گەیاندە دەرەوە. نازانم چەند لە حەوشەی مزگەوتەکەدا گریام. ئیتر نە مرۆڤەکان و نە مزگەوتەکان منیان نەدەویست.

ئەو ئێوارەیە بڕیار وابوو بۆ پێشکەشکردنی پرۆگرامێك بچین بۆ شارێکی تر. پێداگریم کرد لەسەر ئەوەی کە بە تەکسی دەچم. دەمویست کەمێك سەیری دەوروبەر بکەم و مێشکم هێوربێتەوە.

هەر واشم کرد.

## ڕووداوێکی ئوتومبێل:

لەسەر ڕێگەکەماندا دوو سەیارە بەیەکیاندا دابوو. بریندارەکان هاواریان دەکرد و داوای یارمەتییان دەکرد. ئێمەش خێرا بریندارێکمان لەگەڵ خۆمان هەڵگرت و بردمان بۆ نەخۆشخانە. کچێکی گەنج بوو. حاڵی زۆر خراپ بوو. لە خەستەخانە وتیان بیمەی کۆمەڵایەتی نیە و چارەسەری ناکەین. منیش پێشەکی پارەکەم دا و لەوێ ڕۆیشتم. دوای چەندەها ساڵ بۆ یەکەمجار هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد بە یارمەتیدانی کەسێك، وەلێ تەرم و لاشەکان لەبەر چاوم لانەدەچوون. مەرگ چووبووە کەللەمەوە و هەرچیم دەکرد بۆئەوەی لەبیرم بچێتەوە بێسوودبوو.

لەو شوێنەی بۆی دەچووین ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراوم پێش هات. ڕووداوێکی ئەوەندە نەخوازراوبوو بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا دڵتەنگ دەبووم بەوەی کە بۆچی شانسم نەیهێناوە لەڕێگادا تووشی ڕووداوێکی هاتوچۆ ببوومایە و بمردمایە.

پێشکەشکاری پرۆگرامێك بووم. بینەرێکی زۆر هاتبوون و کەسانێکی زۆر گرنگییان پێدەدام. سەرۆك کارەکەم لە دوورەوە چاوی لێ نەدەترووکاندم و تاقیبی دەکردم. دەترسا لەوەی خۆم بدزمەوە و هەڵبێم یان لەگەڵ کۆمپانیایەکی تردا ڕێکبکەوم، چونکە من بۆ ئەوان کلیلی گەنجینە و سەروەت بووم. بۆیە زۆر بەوریاییەوە ئاگایان لێم بوو.

بۆ ساتێك لە بینەرەکان نزیك بوومەوە و ئەوەندەم زانی دەنگی گوللە هات. کسپە لە شانی چەپمەوە هات. دووەم فیشەك دای لە پشتم. دیاربوو

تەقەکەرەکـە ویسـتبووی بینـێ بـە دڵمـەوە، بـەڵام سـەری نـەگرت. لـە چـاوتروکاندنێکدا بـوو بـە هـەرا و بگـرە و بـەردە. هەسـتم کـرد سـەرم گێژدەخوات و بەرچاوم ڕەش دەبێت. لەجێی خۆمدا کەوتم.

کاتێك لە نەخۆشخانە چاوم هەڵهێنا نەفرەتم کرد لەوەی هێشتا دەژیم. مەرگ تا بەرپێم هـاتبوو. چۆن لـە دەسـتم دا؟ مەگـەر چـی دەبـوو ئەگـەر گوللەکە چەند پەنجەیەك زیاتر ئەولای بگرتایە و لە دڵم هەڵچەقیبایە؟ چـی دەبوو دڵی ڕەش و تاوانبارم بە خوێن بشۆرڕایە و پاك ببوایەتەوە؟ نەبوو و نەبوو..

زۆر خەفەتم خوارد کە لەو ڕووداوەدا نەمردم، چونکە ژیانم زۆر بێ واتـا بوو، بووبووە بارێکی قورس لەسەرشانم. ڕۆژبەڕۆژ گوناھ ناخمی تـاریکتر و وێرانەتر دەکرد. بەڵام بۆم دەرکەوت کە هێشتا لە قووڵایی دڵمدا ئاسەواری پاکی و دروستی ماوە، چونکە نەفرەت لە کارە خراپەکانم دەکەم و بێزیـان لێ دەکەمەوە. ئەمە بۆ من مایەی هیوابوو.

من ئەم ژیانەم نەدەویست. من پێشـتر نەمـدەزانی کۆتـایی یەکـەی بـە ئێرە دەگات. تا گەردنم لە گوناھدا نوقمبووە. هـاوڕێی بـەد و چـاولێکەریی کوێرانە وێرانیان کردم.

دەبوو کۆتایی نیلۆفەری ئەمانەتی دایە و کچەجوانەکەی یادگـاری بابـە بەم شێوەیە بێت؟ نەمدەتوانی بەو جـۆرە بـەردەوام بم. بڕیـارم دا یـا خـوا دەرگای پاکبوونەوەم بۆ دەکاتەوە یا بە دەستی خـۆم کۆتـایی بـەم ژیانـە دەهێنم. ئەگینا بەم ئازارەوە نەمدەتوانی بژیم.

ئەو کەسەیان گرت کە گوللەی پێوە نام. تومەز مـامم بـەکرێی گرتـووە بۆ ئەوەی بمکوژێت! ئای خوایەگیان! تەنانەت ئەم هەواڵە ناخۆشە ئومێـد و هیوای پێ دامەوە. کەواتە هێشتا کەسێك هەیە لـە ژیانمـدا کـە خـۆی بـە

خاوەنی من دەزانێت و ئاگای لێمە! کەواتـە کەسێك هەیە نـاوی منـی بـیر ماوە و دەڵێت:" نیلۆفەری ئێمە ڕێی چەوتی هەڵبژاردووە"!

ئـەو ڕووداوە دەرگـای ئومێـدی لـێ کردمـەوە. مـادەم هێشـتا بـەم حاڵەشمەوە یەکێك بەدوامدا دەگەڕێت، تۆ بڵێیت بمتوانیایە دەربـازببم؟ یا بە ژیان یا بە مـردن.. جیاوازییـەکی نـەبوو، هـەردووکی بـۆ مـن ڕزگـاربوون بوو.

هەرچەندە زۆریان لـێ کـردم و ویسـتیان بیدەنـە دادگا، بـەڵام مـن لـە تەقەکەرەکـە خۆشـبووم و چـووم بـۆ سـەردانی و تەنانـەت پارەشـم دا بـۆ ئەوەی لە زیندان دەربچێت. پێم وت:" خوا لێـت ڕازی بێـت بـرا. نـەتتوانی بمکوژیـت، بـەڵام ئیشـەڵا ئـەم هەوڵـەت دەبێتـە مایـەی هەسـتانەوە و زیندووبوونەوەی من".

نزیکەی پێنج ساڵ دەبوو لەو ژیانە نەگریسەدا چـەقیبووم. پێـنج سـاڵ کـە گشـت جوانییـەکانم تێـدا دۆڕانـد.پێنج سـاڵ کـە هـەر ڕۆژە و زیـاتر نغرۆدەبووم و پتر پیردەبووم و لەخۆم دووردەکەوتمەوە.

## یارمەتی ڕێکخراوە خێرخوازییەکانم دەدا:

لە هەموو ئەو ماوەیـەدا شـتێکم لەیادنـەکردبوو. لـە کـوێ دا هـەژارێك و نەبوویەکم بدیبایە یارمەتیم دەدا. تەنانەت زۆرجار پارەم دەکرد بە خێر بۆ ڕۆحی باوك و دایکـم و دەمنـارد بـۆ مزگـەوت و کۆرسـی قورئـان فێرکـردن. بەڵام نەمدەزانی خێری کەسێکی وەك من چەندێك دایـك و بـاوکمی دڵخـۆش دەکرد.

هەر لەو ساڵەدا پارەیەکی زۆرم بەخشیبوو بە ڕێکخراوێکی خێرخوازی. ڕێکخراوەکە کۆڕێکی لەژێر ناونیشانی (با خێزان بژیەنینەوە) سـازکردبوو و منیـان داوەت کردبـوو. منـیش بەناچـاری چـووم، بێگومـان لەگـەڵ حیمایەکانمدا.

یەکەم کەس کە بانگ کرا بۆ سەر شانۆکە ئەوینی نهێنیم، دڵداری کۆنم، سەیدابوو! ئای خوایەگیان! وەختبوو ڕێك لەوێدا ببوورێمەوە!..

تومەز لە کۆلێجی پزیشکیدا خەریکی لێکۆڵینەوەیە لەسەر خێزان. ئەویشیان وەکو میوانێك داوەت کردبوو. وتارەکەی ئەوەندە جوان بوو بۆ ساتێك بردمیەوە بۆ ساڵانی خوێندنم. بیرم دێت جارێکیان لێم پرسی:

– تۆ بۆ لەگەڵ کچان قسە ناکەیت؟

– لەبەرئەوەی کچن. دەبێت بابەتێکی پێویست هەبێت بۆ باس کردن ئنجا..

– ئێ خۆ من هەم..

لە بەرامبەر ئەم ڕەفتارە بوێر و بێشەرمانەیەی منەوە، ئەو وەك کچێکی بەحەیا سەری داخست و ڕۆیشت. بەداخەوە هەرگیز نەمتوانی ئەو هەستەی ناخمی لا بدرکێنم یان ئەو نەیدەویست تێبگات. لەوانەشە چاك منی ناسیبێت و وتبێتی: "ئەمە بە کەڵکی هاوسەریی نایەت"!

پێکاویەتی. من و ژنێکی سەلاریان کوا وتووە؟ دەمزانی مەحاڵە، بەڵام هێشتا نەمدەتوانی ئاسەواری ئەو خۆشەویستییە لەدڵم دەربکێشم کە لەو ساڵانەدا بەرامبەری دروستبووبوو. خۆزگە ئەوکاتانە تۆزێك ڕووی دەدامێ و پێم نەدەنایە ئەم دنیا نەفرەتیەوە و نغرۆی گوناهی چەپەڵ نەدەبووم. تووشی نەخۆشی ناوبانگ و لەخۆبایی بوون نەدەبووم.

سەیدا لە وتارەکەیدا باسی لەوە دەکرد کە فلۆرت[1] نابێتە پێشەکی بۆ هاوسەرگیرییەکی تەندروست.

---

١– فلۆرت، flort : بە مانای ژیانی ئازادانە و بێ مارەیی کوڕان و کچانی لاو پێش هاوسەرگیری. واتە ژن و مێردایەتی بەڵام بە بێ بوونی پەیوەندییەکی یاسایی و ئایینی لە نێوانیادا. هاوسەرگیری تاقیکراوەشی پێ دەوترێت. واتە ئەگەر کوڕ و کچ بەیەکتریان بە دڵ نەبوو جیادەبنەوە و هاوسەرگیری ناکەن. سەردەمانێك لە ڕۆژئاوا بەرگری لێ

لەڕاستیدا ئەو ژیانی نیلۆفەرێکی دەخوێندەوە کە لەمێژە هەموو جوانی و پاکێتییەکانی دۆڕاندووە. جێم بەخۆم نەدەگرت و ئەمدیو ئەودیوم دەکرد بەشکم ئەمە خوایە بزانێت کە منیش لێرەم، بەڵام سەد حەیف نەیدەبینیم و نەیدەناسیمەوە، چونکە شوێنەوارێك لە نیلۆفەری ڕابردوو نەمابوو.

## هیچ شتێك بە ناوی هاوڕێیەتیەکی پاکی نێوان کوڕ و کچ، بوونی نییە؛

هەمووان گوێیان بۆ سەیدا هەڵخستبوو. هەواڵێکی دەخوێندەوە کەلە ڕۆژنامەیەکدا چاپ کرابوو:

– هاوڕێیەکم هەبوو زۆرم خۆشدەویست و واشم دەزانی ئەویش منی خۆشدەوێت. هەموو ڕۆژێك دەچووینە دەرەوە و پێکەوەبووین. هاوڕێیەتی یەکەمان بێگەرد بوو. بەو جۆرە زیاتر یەکترمان دەناسی و بەباشترین شێوە خۆمان بۆ هاوسەرگیری ئامادە دەکرد. پێمان دەووت " هاوسەرگیری کاتیی بێ مارەیی ". پێمان وابوو کە ئەمە ڕاستی یە و هیچ هاوسەرگیری یەکی ڕاستەقینە بێ ئەم قۆناغە، سەرکەوتوو نابێت. دەبوو پێشتر ئامادەبین بۆ هاوسەرگیری یەکی بەختەوەرانە. بەڵام ڕۆژان و مانگان تێپەڕی و شکڵ و ئاڕاستەی پێکەوەبوونەکەمان گۆڕا. هەستی من و هاوڕێکەم جیاوازبوو، واتە ئەستەم بوو پێی بڵێین بێگەرد و هاوڕێیەتی. کاتێك هەستم بەمە کرد کارلەکار ترازابوو. ئەوەی ویستی لە منی سەند و لێیدا ڕۆیشت. منیش بەتەنیایی و دۆڕاوی مامەوە.

---

دەکرا بە گومانی ئەوەی گوایە مەرج و پێویستی یە بۆ هاوسەرگیرییەکی دامەزراو و بەختەوەر. (وەرگێڕ)

عادەتی کۆمەڵگەکەم جیاوازە، ئێمە لە ئەوروپا و ئەمریکا ناژین. بۆیە لەمەدا هەڵە دەکەین. گەر پشتگیری لە فلۆرت بکەین بە مانای "پێکەوەبوونی بێ مارەیی" و "هاوسەرگیری تاقیکراوە"، ئەمە واتای ڕووخاندنی خێزان و هاوسەرگیری بەختەوەرانەیە.

ئەوانەی تیۆری فلۆرت دەنووسن زۆر جوان و قەشەنگ دەیخەنە ڕوو. ئێمەش بەمە دەخەڵەتێین. دەڵێن:" خۆ پیاوان زەلام ناخۆن، قەیچێکا پێکەوەبن و بگەڕێن و ڕابووێرن. بەدڵتان بوو شووی پێ بکەن، نەبوو جیاببنەوە".

لە ڕووکاری دەرەوەیدا لۆژیکییە، وا نییە؟ نەخێر، هیچ وا نییە. لە سەدا نەوەدی ئەو پیاوانەی فلۆرت دەکەن ئێمەی کچان وەك نێچیرێك دەبینن. ڕۆڵی باشترین کەسی دنیا دەبینن تا ئەوەی دەیانەوێت دەیبەن. ئەی دوای ئەوە؟ ڕووی ڕاستەقینەیان دەردەکەوێت. کام لا دۆڕاوە؟ بێگومان ئێمە.. ئەوانیش دەچنە ڕاوی کچێکی داماوی تر".

ئەم چیرۆکی خیانەتە زۆر کاری لێ کردم. دەتووت سەرگوزەشتەی منە. نەفرەت و جوێنی زۆرم نارد بۆ ئەو مامۆستایانەی ئەم ژیانە درۆییەیان لا جوان کردم. لە دواڕۆژدا یەکەمین کەسانێك کە یەخەیان دەگرم ئەوانن.

سەیدا بەردەوام بوو:

– فلۆرت و پێکەوەبوونی کچ و کوڕ، جارێك بە نیەتی باش و جارێك بە نیەتی خراپ دەکرێتە باس و خواسی کۆمەڵگە. بەداخەوە پسپۆڕ و ناپسپۆڕ، هەریەکەیان شتێك دەڵێن لەبارەیەوە. بۆیە دەبنە مایەی سەر لێشێواندنی خەڵکی. هەیە بە نیەتێکی پاك و بەویژدانەوە باسی دەکات، هەیشە بۆ ئەوە دەیوروژێنێت چونکە دوژمنی هەموو بەهایەکی مەعنەوی و دینی کۆمەڵگەیە.

ئێمە بێ بڕیاری لەپێشینە و بە کورتی هەوڵ دەدەین لە ژێر ڕۆشنایی زانست و ژیری و کۆمەڵگە و بەها ڕەوشتی یەکاندا هەڵیبسەنگێنین. چاکەی چییە و خراپەی چییە؟

ئەوانەی پشتگیری لە فلۆرت دەکەن دەڵێن هاوڕێیەتی کچ و کوڕ ڕاستی یەکی ژیان و بەڵگەنەویستە. چۆن کوڕ و کوڕ و، کچ و کچ هاوڕێن، کچ و کوڕیش دەتوانن هاوڕێ و دۆستی یەکتربن. ئەمە پێویستی یەکی بەشارستانیبوون و هاوچەرخی یە. جگەلەمەش کچ و کوڕ زۆر باشتر لەیەکتر شارەزا دەبن و ئەمەش دەبێتە هۆکار بۆ ژیانی خێزانیی بەختەوەر و تەمەن درێژ.

ئەوانەشی دژی دەوەستنەوە دەڵێن: " پێکەوەبوونی بێ مارەیی و هاوسەرگیری کوڕان و کچانی لاو و نەبوونی هیچ پەیوەندی یەکی یاسایی لەنێوانیاندا، هەم پێچەوانەی بەها ڕەوشتی یەکانە و هەم مەترسیدار و زیانداره بۆ ژیانی هاوسەرێتی یان. ئەگەر دوو گەنج یەکتریان بەدڵ بێت و بەمەبەستی ئامادەکاری بۆ هاوسەرگیری بیانەوێت زیاتر یەکتر بناسن، ئەمە زۆر ئاسایی یە. لە شوێنێکی گشتیدا یان لەگەڵ بوونی کەسی سێهەمدا دەتوانن بدوێن و شارەزای یەکتربن. لە چوارچێوەی بەها ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی یەکاندا یەکتری دەناسن. ئیتر پێویست ناکات چەندەها هەفتە و مانگ بەتەنیا پێکەوەبن."

## فلۆرت چەندین گەنجی لەناو بردووە:

ئەگەر مەبەستیشمان ئەوەبێت کە کچ و کوڕ چەندەها مانگ، بەڵکو چەند ساڵێك بێ ڕەچاوکردنی یاسا ئەخلاقییەکان پێکەوە بژین، ئەمە نە ڕاستییەکی لۆژیکی و دینییەو نە بەڵگەی زانستیی لەپشتە. واتە ئەگەر مەبەست لە ناسین بێت چەندەها جار دەتوانن لەگەڵ بوونی کەسی

سێهەمدا یەکتربیینن. بەڵام ئەگەر لەژێر ناوی فلۆرتدا ئارەزووە گەنجانەکان تێربکرێن، کەس لەگەڵ ئەمەدا نییە.

سەیدا لە وتەکانی بەردەوام بوو و هەموو سالۆنەکە بەدیققەتەوە گوێیان بۆ گرتبوو:

– من وەك کەسێك کە لە ئەوروپا ژیاوم دەمەوێت هەندێك ئەزموونی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە. ئەم چەند ساڵانەی ڕابردوو بەداخەوە لەزۆر جێگەی ئەورووپادا فلۆرت (هاوسەرگیری تاقیکراوە) بەئامانجی لەناوبردنی پیرۆزیی هاوسەرگیری، بووبووە مۆدە. هەندێك بە گومانی ئەوەی هاوسەرگیری بەختەوەرانە مسۆگەردەکەن، دەستووری " پێش ئەوەی بیکڕیت تاقی بکەرەوە"یان جێبەجێ کرد. گوایە ئەو دوو گەنجە پتر لە کەسێتی یەك تێدەگەن و ڕێ خۆشکەرە بۆ هاوسەرگیرییەکی تەندروست. ئەوەی جێی سەرسووڕمانە ئەوەیە کە ئەم دوو لاوە ماوەیەك پێکەوە وەك ژن و مێرد دەبن و گەر پێکبێن دەبێتە هاوسەرگیری، ئەگەرنا دەتوانرێت دووەم و سێهەم و هتد...تاقی بکرێتەوە. ئەمە لە کاتێکدایە کە هەردوولا لە هاوسەرگیری کاتیدا لایەنی خراپیان بۆ بەرامبەر دەرناخەن. هەمیشە بەوریاییەوە مامەڵە دەکەن. هیچ کات سروشتی و واقیعی نابن. هەموو ساتێك لە ترسی جێهێڵراندان. بە هەست و شەوقی گەنجانەوە هەوڵ دەدەن خۆ لەبەرچاوی یەك خۆشەویست بکەن.

لە قۆناغی فلۆرتدا هەردووکیان دەڵێن: " ڕێك ئەوەیە کە دەمویست. لە هەموو ڕوویەکەوە لەگەڵ یەك دەگونجێین". بەڵام لەگەڵ تەواوبوونی مانگی هەنگوینی و دەرکەوتنی ڕووی ڕاستەقینەی هەردووکیان، کێشەکان دەست پێ دەکەن. بۆی دەردەکەوێت لەگەڵ کەسێکی هەڵەدا هاوسەرگیری کردووە، ڕاستر بڵێین دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئەمە ئەو کەسە نییە هاوسەرگیری لەگەڵدا کردوە. چونکە لە کاتی فلۆرتدا بۆ خۆ

خۆشەویستکردن هەموو شتێك دەکەن. بۆیە بیر لە ویستی خۆی ناکاتەوە و تەنها گوێ بە حەزی بەرامبەر دەدات.

ئەم دووانەی کە تەنها هەستی عاتفی کۆی کردوونەتەوە، کاتێك جۆش وخرۆشی ڕۆمانسیەت دەنیشێتەوە و بە چاوی ئەقڵ یەکتری هەڵدەسەنگێنن، ئیتر لێرەوە ڕێك نەکەوتن و لێك حاڵینەبوون دەست پێدەکات.

## هاوسەرگیری تاقیکردنەوە:

تەنانەت لە ئەمریکا کە سەرچاوەی (هاوسەرگیری تاقیکردنەوە)یە، ئیستا بە چاوی ڕەخنەوە لێی دەڕوانرێت. چونکە وەها هاوسەرگیرییەك پیرۆزیی خێزان لەناودەبات. ئافرەتان وەکو کاڵایەك لێ دەکات کە پێش کڕین تاقیدەکرێنەوە.

تەنها ژیری و هەست بەس نییە بۆ هاوسەرگیری و دامەزراندنی دامەزراوەیەکی پیرۆزی وەك خێزان. ئەو لێکۆڵینەوانەی لە ئەوروپادا لەسەر فلۆرت کراون ئەنجامی باش دەرناخەن.

گریمانەی جیابوونەوە لە نێوان ئەو جووتانەدا کە فلۆرتیان پێش هاوسەرگیری کردووە و ئەوانەی نەیانکردووە لە سەدا پەنجا زیاترە. ئەمەش ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکە کە داتای پەنجاساڵی تێدا بەکارهاتووە.

جێفری لارسۆن، توێژەر لە زانکۆی بریگهام یەنگ، دەڵێت:" ئەو کچ و کوڕانەی پێش هاوسەرگیری پێکەوەبوون، لە هاوسەرگیریدا ئەوە نادۆزنەوە کە خەونیان پێوە دەبینی. ناتوانن خێزانێکی هاوسەنگ و درێژخایەن پێکەوە بنێن". لارسۆن ئەو خاڵانەی کە دژایەتی فلۆرتی پێش هاوسەرگیری دەکەن، ڕیز دەکات:

١- کوڕ و کچ دوای هاوسەرگیری ڕەسمی تێدەگەن کە ژیانی پێشوویان یاسا ڕەوشتی و کۆمەڵایەتییەکانی بەزاندووە و لێی پەشیمان دەبنەوە و ویژدانیان ئازاریان دەدات.
٢- بەهۆی ژیانی نایاسایی و پابەندنەبوونیان بە بەها ئەخلاقییەکانەوە نێوانیان لەگەڵ دایك و باوکیان تێکدەچێت.
٣- تووشی نائومێدی دەبن کاتێك دەبینن پێکەوەبوونی پێش هاوسەرگیری هیچ سوودێکی نەبووە بۆ سەقامگیرکردنی خێزانەکەیان.
٤- ئەو منداڵە نایاسایی یانەی لە ئەنجامی فلۆرت لەدایکبوون یان ئەو منداڵانەی بەهۆی جیابوونەوەوە بێکەس دەمێننەوە، دەبنە مەترسی بۆ سەر کۆمەڵگە.

ئەو کچ و کوڕە گەنجانەی کە هێشتا مارەیی یاسایی لەنێوانیاندا نییە و پێکەوە دەژین، زۆرجار هەموو سنوورەکان دەبەزێنن، چونکە خۆگرتنەوە و پارێزکردن ئەستەمە. هەر بۆیە زۆربەیان پێش مارەبڕین جیادەبنەوە. گومانیش لەسەر کچەکە دروست دەبێت.

لە توێژینەوەیەکدا لە ئەڵمانیا دەرکەوتووە کە لە سەدا هەشتای ئەو خێزانانەی لە ئەنجامی فلۆرت پێکهاتوون، تووشی هەڵوەشانەوە دەبن. ئەمەش هەواڵدەری دۆخێکی نائاسایی و ترسناکە.

لەپاش ئەم داتا مەیدانییانە ئەم پرسیارە دەکەم: ئایا پیاو و ژن دەتوانن ببنە هاوڕێی ڕاستەقینە؟

## دەمویست تەمەنێك لەگەڵ تۆ بژیم:

سەیدا بە پێشکەشکردنێکی جوان و دەنگی کاریگەری بووبووە جێی سەرنجی ئامادەبووان، یان من وام هەست دەکرد. وتارەکە تا بڵێی زانستی و لۆژیکی بوو، هەروەها بەڵگە و داتای مەیدانی بابەتەکەیان بەپێز کردبوو. گوێگرتن لێی و قەناعەت نەکردن و تەنانەت هەست نەبوون، شتێك نەبوو

بەدەستی من بێت. من لە دنیای خۆمدا نوقم بووبووم و لێپرسینەوەم لەگەڵ ڕۆحمدا دەکرد.

ئاە سەیدا ئاە! چەند ویستم لەگەڵ تۆبم و تەمەنێکت لەگەڵدا بەسەرببەم، خۆزگە دەتزانی!..

سەیدا هاودەم لەگەڵ چەپڵەی ئامادەبووان چووەوە جێی خۆی. زۆرم حەزدەکرد بچم بۆ لای، بەڵام بە چ ڕوویەکەوە؟ پەشیمان بوومەوە.

هەرچی پیاوبوو دەیویست قسەیەکم لەگەڵ بکات و بووبوونە پەروانەی دەورم، کەچی من تەنها دەمویست بگەم بە سەیدا. بەڵام هەرچەندم دەکرد دەستم نەیدەگەیشتێ، زۆر لەوە پاکتربوو دەستی گوناهکاری منی بگاتێ. جگەلەوەش ئەو خێزانداربوو. خانمێکی شیرین و بێگەرد ژنی بوو.

لەوەدابووم حساب و کتابم لەگەڵ نەفسی خۆمدا دەکرد کاتێك دیمەنێکی زۆر چاوەڕواننەکراوم دی. نووورای بەرەو تەختی شانۆکە سەرکەوت. ئەو یەکێك بوو لە بێباوەڕترین کچانی پۆلمان. باوەڕم بە چاوی خۆم نەکرد. بەڵێ، نوورای خۆی بوو. ئەو کچەبوو کە ناوی دین و ئیمانت لا بهێنایە شێت و هار دەبوو.

ئای خوایەگیان! ئەگەر ناوی نەخوێنرایەتەوە هەرگیز نەمدەناسیەوە. پێنج ساڵ دەبوو نەمبینیبوو، چۆن بمناسیایەتەوە؟ سەرتاپای جوان داپۆشرابوو. چۆن شتی وا دەبێت؟ شتەکان لە مێشکمدا تێکەڵ و پێکەڵ بووبوون. گەر کەسێکی وەك نوورای بگەڕێتەوە کەواتە کەسی بێدین لەسەر زەویدا نەماوە..

بانگیان کرد بۆ وتار خوێندنەوە بەناوی سەرۆکایەتی گشتی کۆمەڵەی خێرخوازیی دایکان.. چەند جوان بوو ئەو دیمەنە، چەند قەشەنگ بوو ئەو خزمەتانەی دەیانکرد! ئەی من؟ ئەی نیلۆفەر کە تاوان چواردەوری تەنیوە؟ تۆ چی دەکەیت؟ تۆ خزمەت بە چی دەکەیت؟ کۆتایی تۆ چی

دەبێت؟ تۆ چ کارێکت کردووە تا دەستخۆشیت لێ بکرێت؟ خوا لەناوم بەرێت. ئەم بەڵای جوانییە چی بوو پێمەوە؟ خۆزگە کچێکی ناشیرین و بێناو بوومایە لە دێکەی خۆماندا، وەلێ بە ناموس و حەیاوە لە ماڵی خۆمدا بمردمایە..

نووڕای خان وتارەکەی دەربارەی سەربەستی سێکسی بوو. بابەتێک بوو لەگەڵ ژیانی پێشووی دا دەگونجا. لەوانەشە تەنها ئەزموونی ساڵانی ڕابردووی خۆی بگێڕێتەوە.

## سەربەستی سێکسی بووەتە کارەساتێکی کۆمەڵگایی:

بە دڵ گوێم گرتبوو.

– شەپۆلی بەرەڵایی کە لە ئەمریکا و ئەورووپا پەرەی پێدراوە، لە ئێستادا بووەتە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی مەترسیدار. خێزانی موسوڵمان بەو هێزەی لە باوەڕ و داب و نەریتیەوە وەریدەگرێت بەتوندی ڕووبەڕووی ئەم تەوژمە بووەتەوە. بەڵام لەو خێزانانەدا کە بەها ڕەوشتی یەکان تێیدا بەهێزنین، زیانی زۆری گەیاندووە.

ئازادی سێکسی بە مانای ئەوەی گەنجان چۆنیان پێ خۆشە وا بژین، ئایا ئەوە ئازادییەکی ڕاستەقینەیە؟ یان تەوژمێکە هێلانەی پیرۆزی خێزان وێران دەکات و بەها باڵاکانی کۆمەڵگە ڕادەماڵێت؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لە لایەن دەروونناس (ستینێت)ەوە دەدرێتەوە کە ئەندامی کۆمەڵەی هاوسەرگیری و نۆژەنکردنەوەی خێزانی ئەمریکییە. لە نووسینێکیدا دەڵێت:" سەربەستی سێکسی پرۆژەیەکە بە هەڵە دەستی پێکردووە و لەسەر هەڵە ڕۆیشتووە و لەئەنجامدا بە هەڵە گەیشتووە. گوایە بۆ ئەوەی گەنجان کەسێتی زایەندیی خۆیان بناسن، خۆمان تووشی کارەساتێکی گەورە کردووەتەوە. چونکە ئارەزووی بەرەڵا هیچ یاسایەکی نەناسی و زیانی گەیاند. ئەو گەنجانەی ئارەزووە بێسنوورەکانیان

ناڕاستەی ڕەفتاریانی دەکرد مافی تاکەکەس و مەحرەمیەتی خێزان و بەها ڕەوشتییەکانی کۆمەڵگەیان نایە ژێرپێ. ئەنجام تەنها کچانی جێهێڵراو لەباری دەروونی شڵەژاودا و ئەو منداڵە نایاساییانەبوون کە کەس خۆی ناکات بە خاوەنیان. ئەم کارەساتە ناکرێت ئاوا بەردەوام بێت. هەر کۆمەڵگەیە و پێویستە باوەڕێکی ئایینی و بەهای ئەخلاقیی باڵای هەبێت. دەبێت تا دەتوانین خێزان بەهێز بکەین و ڕێ بدەن پیاوانی ئایینی هەستن بە ڕۆڵی خۆیان. کچانی لاو لە لادان بپارێزرێن و، خێزان بەهای پیرۆزی خۆی پێ بدرێتەوە".

پێش ئەوەی حاڵمان بە حاڵی ئەمریکا و ئینگلتەرا و فەرەنسا و ئەڵمانیا بێت کە هەنووکە پرۆژەی "گەڕانەوە بۆ خێزان"یان ڕاگەیاندووە، پێویستە بزانین ئەو کێشە و گرفتانە چین کە ئەم تەوژمە وێرانکەرە وڵاتمان تووش دەکات.

لە زۆرێک لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا شاڵاوی سەربەستی سێکسی جومگەکانی کۆمەڵگە – بەتایبەتی خێزان – لەڕووی ئەخلاقییەوە دەڕمێنێت و بێ متمانەیی لەنێو تاکەکانی کۆمەڵدا چێدەکات. واتە ئەگەر بەرەڵایی بکەوێتە سەر کوچە و شەقامەکان، ئەوکات ئاسایشی کۆمەڵ لە مەترسیدایە. دەبێت جووتبوون وەکو پێویستییەکی پیرۆز لەچوارچێوەی خێزاندا دابین بکرێت.

گەورەترین زیانی ئەم تەوژمە ئەو پەستانەیە کە دەیخاتە سەر دەروونی مرۆڤ. چونکە خۆشەویستی مرۆیی لەناودەبات و جووتبوون دەکاتە کارێکی بێ هەست و سۆزی میکانیکی و کاتی. دیارە ئەمەش دەروونی مرۆڤ بێزار دەکات.ئەم تەوژمە وەك زریانی بەهێزی ڕامالەر ڕووی لە وڵاتانی ڕۆژئاوا کردووە. ئافرەتانی ئەمریکا بەرەڵایی بە دەمامکێك دەزانن و، مرۆڤ و بەتایبەتی ژنان دەکات بە کۆیلە.

هەژانی ڕاستەقینە لە ڕۆژئاوا لە ساڵانی هەشتاکاندا بە دەرکەوتنی ئایدز دروستبوو. سەرەڕای گرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتی یەکانی، دەبووە مایەی سەرهەڵدان و گواستنەوەی چەندەها نەخۆشی جەستەیی ترسناك. هەریەك لە ئایدز و زوهەری و دەستدرێژی سێکسی و خۆکوژی و ماددەی هۆشبەر و نەخۆشی دەروونی و تاوان، لە ئەنجامە تاڵەکانی بەرەڵایین.

## سەربەستی سێکسی دژی ئافرەتانە:

هەموو ئەم نەخۆشی یانە ئەنجامی ژیان و پێکەوەبوونێکی نایاسایی و ناشەرعین. خۆرئاوا ئەمڕۆ لە سەرسووڕماندایە. زۆرێك هەن لە ترسی تووشبوون بە ئایدز ژیانیان بۆتە ژەهر و تەنانەت هی وا هەبووە لە ترسدا خۆی کوشتووە. ملیۆنان کەس لە باری دەروونی خراپدا دەژین و مرۆڤی ڕۆژئاوایی سەرسامە.

بە ڕەچاوکردنی هەموو ئەم زیانانە دەردەکەوێت کە سەربەستی سێکسی نە بۆ پیاو و نە بۆ ژن سوودێکی نییە. ئەم حاڵەتە چ بۆ تاك و چ بۆ خێزان و کۆمەڵگە خراپەی بێشوماری هەیە.

لە لایەکی تریشەوە ئەنجامە بەدەکانی بەرەڵایی زیاتر بەر ئافرەت دەکەون. چونکە بە بەراورد لەگەڵ پیاودا ژن زیاتر دەدۆڕێت. پیاو دوای ئەوەی بەدڵی خۆی ژیا پشت هەڵدەکات و دەڕوات، بەڵام ئەی ژن دەتوانێت قوتاری ببێت؟ ڕوو بکاتە هەر شوێنێك دەکەوێتە ژێر پەستانی دەروونیی کۆمەڵگەوە. هەمیشە بە چاوی کەمەوە بۆی دەڕوانن. هەر جێهێڵرانێك چەندەها زامی قووڵ لە ڕۆحیدا چێدەکات.

ئەکتەری ئەمریکی، جۆرج هاملتن، بەم شێوەیە باس لەم ڕاستییە دەکات:" ژنان بە دوای پیاوێکدا دەگەڕێن کە پێیان بڵێن: من پیاوم و دەتپارێزم و ئاگام لێت دەبێت. گرنگیت پێ دەدەم. ئافرەتان وا دەخوازن

لە ژیانیاندا بە یەك پیاوەوە پابەندبن نەك ئەمڕۆ لەگەڵ پیاوێك و سبەی لەگەڵ یەکێکی تردا بن".

لەبەر ئەم هۆیانە سەربەستی سێکسی لە ئەوروپادا ڕۆژبەڕۆژ گرنگی خۆی لەدەست دەدات. هاوسەرگیری و خێزان کە سەرچاوەی خۆشەویستی و میهرەبانین سەرنجی مرۆڤی خۆرئاوایی بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن. هاوسەرگیری و دایکایەتی کە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا بووبووە عەیبە و لەبیرکرابوو، ئەمێستا بوون بە چەمکانێك کە خۆزگەیان بۆ دەخوازرێت.

بەپێی ڕاپرسییەك لە سەدا شەستی ئافرەتانی ڕۆژئاوا کاتێك شوودەکەن کە پیاوێکی ڕاستگۆ بدۆزنەوە.

مامۆستا سەعیدی نوورسی لەم بارەیەوە دەڵێت:" ئەگەر پیاو لەپێناو لەزەتێکی هەشت دەقیقەیی دا تووشی کارێکی خراپ ببێت، ئەوا تەنها چەند لیرەیەك زیانی لێ دەکەوێت، بەلام سزای لەزەتێکی هەشت دەقیقەیی ئافرەت کۆڵێکی قورسی هەشت مانگی و ، ئەرکی پەروەردە و بەخێوکردنی منداڵێکی بێ کەسە بۆ ماوەی هەشت ساڵ! واتە ئافرەت لە خراپکاریدا بە پیاو ناگاتەوە، بەلام تۆڵەی خراپکاریەکەی چەندین جاری تۆڵە و سزای پیاوە.

چارەسەری ڕاستەقینە و شیفابەخش بۆ ڕزگارکردنی ئافرەتان لە چنگی ئەو تەقەلایانەی کە بۆ لەڕێ دەرکردنیان و تێکدانی ژیانی دنیا و قیامەتیان دەدرێت و ، تاکە هۆی پارێزگاریی ڕەوشتە بەرزەکانی

سروشتیان لە داوی فەساد و خراپکاری، تەنها لە پەروەردەکردنیاندایە بە پەروەردەیەکی ئیسلامی، کە هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە".[1]

زانای ئەمریکی (واکسلەر)یش بەم ئەنجامە گەیشتووە:" گشت کتێبە ئاسمانییەکان هاوسەرگیری و خێزانیان بە پیرۆز داناوە و گرنگییان پێ داوە. ئەو مرۆڤانەشی پەیڕەوییان کردووە، چەندەها سەدەیە بە شادمانی ژیاون و یەکتریان پاراستووە. بە مرۆڤە بەدبەختەکانی ئەم سەردەمەدا دەزانرێت کە تەوژمی ئازادی سێکسی چەند وێرانکەر و ترسناکە."

نووورای وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی بە گەرموگوڕی و جۆش و خرۆشەوە وتارەکەی پێشکەش کرد.

## نیلۆفەر ئەمە تۆیت؟!

منیش ڕاڕایی دڵمی ئەنجن ئەنجن دەکرد و جێم بەخۆم نەدەگرت. دەبوو هەرچۆنێك بووە بگەم بە نووورای یان سەیدا. حیمایەکەی تەنیشتم بانگ کرد. هەردووکیانم نیشان دا و وتم دەمەوێت لەگەڵیان قسە بکەم.

حیمایەکان یەکسەر کەوتنە کار. لە ژوورێکدا چاوەڕێیان بووم. هەڵدەلەرزیم. دەتووت خوێنم تێدا نەماوە و خانەکانی جەستەم لەیەکتر جیادەبنەوە. زۆر بێحاڵ بووم. بەهەزار حاڵ خۆم گرتبوو نەبوورێمەوە. لە چەند چرکەیەکدا هەموو گیانم نیشتە سەر ئاو.

کە خۆیان کرد بە ژووردا هەناسەم سواربوو و هێزی ئەژنۆم بڕا. نووورای بە سەرسووڕمانەوە وتی:

– باوەڕناکەم! نیلۆفەر ئەمە تۆیت ؟

---

١– پەیامەکانی نوور، بریسکەکان، (لا ٤٠٦، ٤٠٨). لە دانراوەکانی زانای گەورەی کورد مامۆستا سەعیدی نوورسی . دەقی کوردی ئەم پارچەیە لە وەرگێڕانەکەی مامۆستا فارووق ڕەسووڵ یەحیاوە وەرگیراوە. (وەرگێڕ)

باوەشی پێدا کردم. هەستم بە گەرمی و دۆستایەتی و خۆشەویستی کرد.

سەیدا بە زەردەخەنەوە وتی:

– خۆشحاڵم بە بینینت نیلۆفەر خان.

دانیشتین. لەگەڵ ئەو دوو مرۆڤە پاکەدا من چوویبوومەوە قاوغەکەی خۆم و شەرم دایگرتبووم. دەترسام هەڵە و تاوانەکانم بدەنەوە بە ڕوودا و سەرزەنشتم بکەن، بەڵام سەیدا دیسان سەلماندی کە جیاوازە. وتی:

– پیرۆزباییت لێ دەکەم نیلۆفەر خان. زۆرێک لە ئافرەتە هاوپیشەکانت پارەکانیان لە پشووی شارە گەشتیارییەکاندا سەرف دەکەن، بەڵام تۆ دەیبەخشیتە ئەم ڕێکخراوە خێرخوازییانە. تۆ هەمیشە ئافرەتێکی ژیربوویت و ڕەچاوی باوەڕ و داب و نەریتی خۆت کردووە. کەوایە هەوڵ دەدەیت شایانی باوکی شەهیدت بیت. بەڕاستی پیرۆزباییت لێ دەکەم.

ئەم قسانە وەك تیر لە دڵم هەڵچەقین و پڕیان کرد لە خوێن. لە بەرامبەر سەیدادا هێندە شەرمم دەکرد، تەواو بڕستی بڕیبووم. بەداخەوە سەیدا ئاگای لەمە نەبوو. بە گومانی باشەوە تەماشای ڕووداوەکانی دەکرد و هەوڵی دەدا ئەو تۆزە چاکەیەی لە دڵمدا ماوە بگەشێنێتەوە. لەوانەیە بەمە ویستبێتی بڵێت:" بەسە ئیتر. دوای هەموو ئەوانەی بەسەرت هات عارت نەنا؟ خۆت ڕزگاربکە لەو ژیانە نزمە. وەرەوە هۆش خۆت"!

نووڕای پێش ئەوەی بکەوێتە زەلکاوەکەوە قوتاری بووبوو. شووی کردبوو بە هاوڕێیەکی سەیدا. ئەو کوڕەشم دەناسی. لە پۆلێکی تر بوو بەڵام هەردەم لەگەڵ سەیدا دەگەڕا.

نووڕای ئەمێستا دەروونناس بوو. مێردەکەشی لە شارۆچکەیەك حاکمە. هەردووکیان بەختەوەرن.

لانەیەکی ئارام و گەرم هەمیشە خەونی من بووە، وەلێ قەت نەبوو بە ڕاستی..

## تروسکاییەکی ئومێد لەدڵمدا هەبوو:

خەریك بوو گریان زۆری بۆ دەهێنام. بۆ ئەوەی نەڵێن هیچ ناڵێت هەروا بە سەیدام وت:

– ژنێکی زۆر شیرینت هەیە ماشەڵا. خوا لە یەکتان نەکات. چۆنە؟ منداڵتان هەیە؟یەکسەر ڕوخساری سەیدا گۆڕا و بزەیەکی تەڵخ کەوتە سەر لێوی. نووڕایش ڕەنگی گۆڕا. تێگەیشتم کە شتێك بووە. نووڕای وتی:

– لەوانە تۆ نەتبیستبێت نیلۆفەر گیان. پار خێزانەکەی سەیدا و کچە دوو ساڵانەکەی لە ڕووداوێکی هاتوچۆدا کۆچی دواییان کرد.

گەرووم گیرا و وشەیەك چییە بۆم نەدەهات. تەنها لەژێر لێوەوە وتم:" خوا ڕەحمیان پێ بکات. زۆرم پێ ناخۆشە".بۆ ساتێك چاوم کەوتە سەر چاوی سەیدا. فرمێسك تا سەر ڕوومەتی ڕیزی بەستبوو. وتی:

– خۆش بیت. خوای گەورە وای ویست. بێگومان حیکمەتێکی تێدایە. ئەوان شەهید بوون. جانتای ژنەکەم قورئانی پیرۆز و پەیامی خوشکانی تێدابوو، خوێنـاوی بووبوون.. لەو ڕۆژەوەی ژن و مێردبووین نەمدی بێ دەستنوێژ بسووڕێتەوە، قەت پەرستشەکانی لەبیرنەدەکرد.[1] ، لە دڵی خۆمدا وتم: " خوایەگیان! مەرگی چەند جوان دەدەیت بە خەڵك! کۆتایی قەشەنگ دەکەیتە نسیبیان. ئەی من؟ ئەی ئەوانەی کە وەك من وان؟ ئێمە حاڵمان چۆن دەبێت؟ کێ ئێمە قبووڵ دەکات؟ کێ باوەشمان بۆ

---

١– پەیامی خوشکان پەیامێکە لە سەرجەمی پەیامەکانی نوور لە دانانی زانای پایەبەرزی کورد مامۆستا سەعیدی نوورسییە. چەند ڕێنمایی و دەرسێکی ئیمانی وردە بۆ خانمان و خوشکان. مامۆستا فارووق ڕەسووڵ یەحیا کردوویە بە کوردی. (وەرگێڕ)

دەکاتــەوە؟ کــێ ڕێمــان نیشــان دەدات؟ ئــەم تەمەنــە هــەر بــە گونــاه پڕدەبێتەوە؟".

ژینم لێوان لێوبوو لە تاوان و چڵك و چەپەڵی. کێ یارمـەتی دەدام پـاك ببمەوە؟ لە کاتێکدا من لە دنیای خۆمدا بووم، سـەیدا و نـوورای هەسـتانە سەرپێ. ناونیشان و ژمارەی تەلەفونیان پێدام. وتیان کە پێویستە زوو زوو یـەکتر ببیـنین. کـە چـوونە دەر مـن بـە حەپەسـاوییەوە لـێم دەڕوانـین. هیوایەکی کز لە دوورەوە هات و لەسەر دڵم نیشتەوە. ئێستا سەیدا سەڵتە. تۆ بڵێی؟ بەڵام مەگەر دەکرێت؟ سەیدا پاك و بێگـەردە و خـۆی بـۆ خـوا و خزمەتی ئیمان تەرخان کردووە.. تەنازول دەکـات بـۆ ژنێکـی وەك مـن کـە هەموو شـتێکی دۆڕانـدووە؟ هەرچـەندە خەیاڵـە، بـەڵام هـەر زۆر جـوان و، دوایین ئومێدە..ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر تایبەت بوو بۆ من. بـۆ چـەند سـەعاتێك چـوومەوە ڕۆژانـی ڕابـردوو. دڵـم ئاسـوودە بـوو. ئـەو گرنگییـەی نـوورای و سەیدا بە منیـان دا سـەرلەنوێ هیوایـان تێـدا بووژاندمـەوە. وابـزانم دەبنـە دەستاوێزم بۆ ڕزگاربوون لەم ژیانە نەگریسە. ئەم بیرۆکەیە ئارامی بە دڵـی تینووم بەخشی.

# بەشی چوارەم

## بڕیارم دا تەوبە بکەم



لەوێدا بڕیاری خۆمم دا. دەبوو هەر بمکردایە. بڕیاربوو پاش چەند ڕۆژێك بۆ کارێك بچم بۆ قۆنیا. بەنیازبووم بچمە حزووری مەولانای ڕۆمی، بەئومێدی ئەوەی خواگیان لەبەر خاتری ئەو پیاوە پاك و بەرزە لێم ببوورێت و پاك ببمەوە.

دەبێت؟

پێویستە ببێت. ئەگەر دەمەوێت ڕزگارم ببێت پێویستە ئەو ڕێ یەش تاقیبکەمەوە. ئەگینا لەوانەیە جارێکی تر هەلی وام نەیەتەوە ڕێ.

هەرچۆنێك بوو خۆم قوتارکرد لە کوڕی خێزانێکی دەوڵەمەند کە ئەو ماوەیە دەوروخولی دەدام. بەیانی زوو لەگەڵ حیمایەکانمدا کەوتمە ڕێ. پڕبووم لە ئاسوودەیی و ئارامی چونکە دەچووم داوای لێ خۆشبوون بکەم. هێندە ئامادەبووم بۆ خۆ ڕاست کردنەوە هەموو هەستەکانم وەك دڵی چۆلەکەیەکی بچووك خێرا خێرا لێیان دەدا.

سەیارەکەمان بەخێرایی ڕێی دەکرد و منیش لە خەیاڵی ئەوەدابووم کە چی بڵێم لەو مەقامە پیرۆزەدا. شۆفێرەکە ڕادیۆکەی کردەوە. پێشکەشکارێك بە دەنگێکی شیرین و کاریگەر باسی لە جوانی ناخ دەکرد. بە شۆفێرەکەم وت:

– با لەسەری بێت، دەمەوێت گوێی لێ بگرم.

جوانی ناخ ئەو هەستە بوو کە ساڵانێکە بیرم چۆتەوە و، لە دەفتەرمدا سڕیومەتەوە و تەنها وەکو یادگاری یەک لام ماوەتەوە. لەمێژبوو جوانی دەرەوەم زاڵ بووبوو بەسەر جوانی ناوەوەمدا. ئەو گۆرانی و ستایشانەی بە باڵا و جوانیمدا هەڵدران و ئەو گوناهە چەپەڵانەی کە بەهۆی نەزانیمەوە تێیان کەوتم، جوانی ناخمیان هەڵکەند و بردیان.

## گەورەترین دەوڵەمەندیی، جوانی دڵ و دەروونە:

گوێم بۆ پێشکەشکارەکە هەڵخست.

– گەر مرۆڤەکان بە گرنگی یەوە لە جوانییەکانی ناخیان بڕوانن و خۆشەویستی و ڕێز بکەنە بنەمای جیهانبینییان، کام کێشەیە هەیە چارەسەری نەبێت؟ لەهەر جێگەیەک سۆزو خۆشەویستی هەبن هەرچی ناشیرینی و خراپە هەن مەحکوومن بە مردن. وەکو ڕەوینەوەی تاریکی لەبەرامبەر ڕووناکیدا و ونبوونی دوژمانیەتی لە هەمبەر دۆستایەتیدا.. جوانی ناخ و سۆز و خۆشەویستی هێندە گرنگن بۆ بەدیهێنانی ژینێکی ئاسوودە، کە هیچ پێویستی بە ڕوونکردنەوە و بەڵگەهێنانەوە نییە. لەڕاستیدا گرنگ ئەوەیە جوانی ناخ چۆن بەدەست دێت؟ خۆشەویستی چۆن دەگەشێتەوە؟ بە مانایەکی تر کەسێک کە بە ئاسانی دەتوانێت دەرەوەی ئارایشت بکات، چۆن دەتوانێت ناوەوەشی بڕازێنێتەوە؟ بەڵێ، مرۆڤ دەتوانێت ناوەوەشی جوان بکات. دەتوانێت ببێتە مرۆڤێک لە خۆشەویستی و، بەختەوەری و ئاسوودەیی بۆ خۆی و کۆمەڵ دابین بکات. بەڵام چۆن ئەمە ئەنجام دەدرێت؟

پێویستە بەر لە هەر شتێک تێبگەین کە زۆر جوان بەدیهێنراوین. بزانین کە سنعەتێکی ناوازە و قەشەنگ و نیانی دەستی پەروەردگارین. بڕواننە بوونی خۆتان. ببینن کە لەناو زیندەوەراندا تایبەتن و هەموو شتێک خزمەت

بە ئێوە دەکات. ڕووی ژیریتان بکەنە دنیای تایبەتی خۆتان کە وەك گەردوونێکی بچووککراوە وایە. هەوڵ بدەن لەو مەسرەفە تێبگەن کە خوای گەورە لەو دنیایەدا بەکاری بردووە. بکۆشن تا بزانن لەبەرامبەر چاو و زمان و مێشك و ئەندامەکانی تری جەستەتان کە ناتوانن نرخێکیان لەسەر دیاری بکەن، چیتان لێ داواکراوە؟

بۆچی هەموو بوون ڕامکراوە بۆتان؟ بۆچی هەزاران نیعەتتان بۆ ڕاخراوە؟ ئەو یاسا و ڕێسا و هاوسەنگییەی کە ژیران سەرسام دەکات و لە کۆشکی جەستەدا دەست بەکارە، بەدیهێنەرەکەیان دەیەوێت چیمان پێ بڵێت و چ پەیامێك دەگەیەنێت؟

مرۆڤ بە ناسین و تێگەیشتن لە خۆی و بە دۆزینەوەی هۆی بوون و ژیانی دەگات بە خاڵێکی گەلێك گرنگ. ئەویش ئەوەیە بزانێت کە بەندەیە. کاتێك مرۆڤ تێگەیشت لەوەی کە بەندەی سازێنەری گەردوونە، لەوەش تێدەگات کە بۆچی دەژی و لەکۆتاییدا دەچێتەوە حزووری کێ. ئیتر ئەم جیهانبینییە گۆڕانکاری مەزن لە ناخی مرۆڤدا بەرپادەکات. لێرەوە مرۆڤ هەوڵ بۆ پێشکەوتن دەدات. خۆی ئامادە دەکات بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی پەروەردگاری. لە پیسی و چەپەڵی پاکژدەبێتەوە. مانای سەرەکی پەرستشەکانیش ئەمەیە. ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی مرۆڤێکی پاك و لێوان لێو لە خۆشەویستی.

## ئاسودەیی تێفکرین:

پاش خۆناسینمان ئنجا بەوردی لە دەوروبەرمان بڕوانین. سەرنشینانی کەشتییەکین کە لە بۆشایی فراوانی ئاسماندا مەلە دەکات. ئەم کەشتییە کە ناوی دنیایە و لەچاو جیهاندا وەك زەڕڕەیەك وایە، گەشتیاران دەگەیەنێت بە مەملەکەتی ئاخیرەت. ئەو دەسەڵاتەی لەوپەڕی ڕێکوپێکیداگەشت بە زەوی دەکات و وردترینی جوانییەکانی تێدا پێشچاو

خستووه، ئێمەش داوەت دەکات بۆ تێڕامان لەم جوانی یانە و ناسینی هونەرمەندەکەیان. پێویستە مرۆڤ بە چاوی پەند و عیبرەتەوە بۆ هەموو شتێك بڕوانێت و، هونەر و دانایی لە ئاسۆکانی بووندا بخوێنێتەوە و لە وردەکارییەکاندا هەست بە پەیامی خوایی بکات. کاتێك مرۆڤ لە جوانی سەرسامکەری بەهار ڕادەمێنێت و، خۆراکی بەلەزەت دەکاتە گەدەیەوە و، هەوای پاك هەڵدەمژێت و، دەبینێت هەزاران نیعمەت بۆ خزمەتکردنی تێدەکۆشن، پێویستە بەوپەڕی حەز و لەزەتەوە سوژدەی شوکرانەبژێری ببات بۆ ئەو زاتەی کە هەموو ئەوانەی خستۆتە بەردەمی. بەمەش دڵ و ئەقڵی پڕبکات لە نوور و ئاسوودەیی.

پێویستە مرۆڤ هەردەم لە بیرکردنەوەدا بێت. تێبگات لەوەی کە ئەوەی لە چواردەوری ڕوودەدات سادە و ئاسایی نین.

گڵی وشك و بێ گیان.. درەخت و قەدی ڕەق و بێ گیان.. لە کۆتایی لقەکاندا کۆمەڵە میوەیەکی ڕەنگاوڕەنگ و بەلەزەت کە تەنها بە زانست و توانستی بێ سنوور دەگونجێت بێنە بوون..

چەندەها دیاری و بەخشش کە ڕازێنراونەتەوە و تام و بۆنی جیاوازیان بەبەرداکراوە..

مرۆڤ کاتێك لە دەوروبەری تێدەفکرێت و، قووڵ دەبێتەوە بۆ دانایی و وردەکاری لە کاروبارەکاندا و ئامانج تیایاندا هەڵدەگۆزێت، تێدەگات لەوەی کە بە چ ناونیشانێکی گەورە و بۆ چ فەرمانبەرییەکی مەزن بەدیهێنراوە. پاشان بەهۆشیاری و لەخۆبوردنەوە لە حزووری پەروەردگاریدا ڕادەوەستێت و دەگات بە جوانیی و خۆشەویستی لە پلەی کەماڵدا.

ئینجا لە قۆناغی سێهەمدا کتێبی زۆر بخوێننەوە. خوێندنەوە تەنها زانیاری پەیداکردن و بەسەربردنی کات نیە. بەڵکو کتێبێکی باش باشترین هاوڕێ و، هاودەمی دڵنەوایی دەر و سەرچاوەی ئارامیی دەروونی مرۆڤە.

تاقیبکەنەوە.. دڵنیام هەستی پێدەکەن.

## ئەوەی یارمەتی بدات یارمەتی دەدرێت:

چوارەم: خۆبەخشانە لە ڕێکخراوە خێرخوازییەکاندا کاربکەن. ئەم پێشنیارەم زوو زوو دەخستە بەردەم خوێندکارەکانم. زۆرێکیان قبووڵیان کرد. لە ڕێکخراوێکدا کاریان دەکرد کە ئامانجی گەیاندنی یارمەتی و هاوکاری بوو بە هەژاران و بێ کەسان. هەرچەندە ڕۆژی وا هەبوو تەواو ماندوو دەبووین، بەڵام ویژدانمان ئاسوودە و دڵمان ئارام بوو. حەز و شەوقی یارمەتیدان و دەستگیرۆیی کردنی نەبوویەک و هەژارێک، جوانی و تامێکی جیاوازی دابوو بە ژیانی خوێندکارەکانم. ئەو کارە سوپاسگوزاری فێرکردن و نرخی ئەو نیعمەتانەیان بۆ دەرکەوت کە پێیان بەخشراوە.

ئێوەش یارمەتی ئەو ڕێکخراوانە بدەن کە لە چواردەورتان هەن. دەبینن کە ناختان سەرڕێژ دەبێت لە خۆشبەختی و سووکنایی.

لەکۆتایی دا مرۆڤە مەزنەکانی دنیای ڕۆح و مانا بناسن. ئەوانەی کە گەیشتوونەتە لوتکە لە جوانی ناخدا. لەم خاکانەدا گەلێك مرۆڤی وا هەڵکەوتوون کە تۆوی خۆشەویستی و ڕێز و برایەتییان لەنێو خەڵکدا ناشتووە. وەکو مەولانای ڕۆمی و یونس ئەمرە و حاجی بەکتاش و بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی و هتد.. پێویستە ژیان و بەرهەم و بیری ئەم مرۆڤە مەزنانە بەوردی بخوێنرێنەوە و سەرنج لە پەیامەکەیان بدرێت.مەولانا کە دەفەرموێت:" هەرکەس هەیت، وەرە."، یونس کە دەڵێت:" دروستکراوانت لەبەر دروستکەرەکەیان خۆشبوێت"، سەعیدی نوورسی کاتێك دەڵێت:" مرۆڤ گەردوونێکی بچووکە"، ئەمانە باسیان لە خۆشەویستیی مرۆڤ و، جوانی ناخ کردووە. ئێوەش سوود لەم حەقیقەتانە ببینن. ئەگەر نەتوانن ناختان جوان برازێننەوە، جوانی دەرەوەتان دەبێتە دوژمنتان.

وتەکانی پێشکەشکارەکە بەپایان گەیشت. زۆر ڕاست بوو. من تێیدا دەژیام. دوای ڕەشبوونەوەی جوانیی ناخم، جوانیی دەرەوەم لێ بووبوو بە دوژمن.

## هەرێمە دلڕفێنەکەی مەولانا:

لە هەرێمی کێشکەر و مەستکەری مەولانادابووم. لەگەڵ نزیکبوونەوەمدا لە نزرگەی پیرۆزی، لەرز سەرتاپای بەدەنمی داگرت. وەك بڵێی لە زستاندا لەبەر سەرما جێماوم، ئەژنۆکانم شەقەشەق دەیاندا لەیەك. حیمایەکەم هەستی پێ کرد و وتی:

– شتێك بووە خوشکێ؟

– نا هیچ نیە، بەردەوام بە.

کاتێك چووینە شارەکەوە سەرەتا لە ئوتێلەکەمان دابەزین. لەوێ پاکبوونەوەی ماددیم بەئەنجام گەیاند و جلوبەرگی گونجاوم پۆشی. پاش چەندەها ساڵ سەرپۆشێکم نایە سەرم. چاویلکەیەکی ڕەشم کردە چاو. هەوڵم دا چەند دەگونجێت جلەکەم درێژبێت. بە حیمایەکانم وت ڕۆژنامەنووسەکانم لێ دووربخەنەوە.

وەختێك گەیشینە مزگەوتەکە فەرمانم کرد بە حیمایەکان:" بە تەنیا جێم بهێڵن. تا دێمە دەرەوە کەس پەیوەندی پێمەوە نەبێت. ئێوە تەنها لە دوورەوە چاودێریم بکەن".

لەگەڵ پێم نایە ناو ئەو مەقامە پیرۆزەوە زریان و تۆفان لە ڕۆحمدا هەڵیانکرد. وەك بڵێی بایەکی بەهێز ڕووی لە دەمارەکانم کرد و بەناو بچووکترین خانەمدا بڵاوبووەوە.

ئاه خوایەگیان! ئەمە چ هەستێکی بەرزە! خەریك بوو لەجێی خۆمدا ببوورێمەوە. لە کەشێکدابووم بڵێسەی ناخمی گەشاندبووەوە. دەبێت چێژ و لەزەتی مەعنەوی و ئاسوودەیی ئیمان هەر ئەمە بێت.

لـە خزمـەتی ئـەو زاتـە پـاك و پیرۆزەدابـووم. هـەموو ئـەو دوعـا و پەشـیمانی و پاڕانەوانـەم هەڵڕشـت کـە ڕۆژانێـك پێشـتر پڕۆڤـەم لەسـەر کردبوون. بۆ یەکەمجار لەو ساڵانەدا هەستم قوڵپی سـەند و فرمێسـکم وەك سێڵاوی بەهار هاژەی کرد. بـۆ یەکـەمجار پەشـیمانیم تواندمیـەوە و تەوبـە ئازایەتی پیّ دام.

– توخوا مامۆستام، ئەی بەندەی خۆشەویستی خودا گوێت لێم بێـت! ببە وەسیلەیەك تا خوای گـەورە لـێم خۆشـبێت. لای ئـەو دوعـام بـۆ بکـە، هیمەتم بۆ بکە. ئەمێستا زۆر پێویستم بە یارمەتیتە. من بەم گوناهانەمەوە ڕووم نیە لە خوای خۆم بپاڕێمـەوە. هـاتم چـونکە خـۆت وتووتـە هەرکـەس هەیت وەرە. ئەمە کۆتا هەلی منە.

دەنگێك کە نەمزانی لەکوێوە هات، وتی:

– نەخێر، ئەمە دوا هەلی تۆ نیە. نائومێد مەبە لە خوای خۆت. چـونکە ئەو لە هیچ بەندەیەکی نائومێد نابیّ.

بەترسـەوە ویسـتم بـزانم دەنگەکـە لـەکوێوە دێـت. بـەڵام کەسـم لـە نزیکەوە نەبوو. وتم لەوانەیە خەیاڵم کردبێت.

چەند کاژێرێك گریـام پاڕامـەوە و فرمێسـکم ڕشـت. وەختێـك هاتمـەوە هـۆش خـۆم بێحـاڵ کـەوتبووم. بـە ئەسـتەم خـۆم گەیانـدەوە ژووری ئوتێلەکەم. نەمدەویست لەو جیهانە مەستکەرە بێمـە دەر، ئـەو جیهانـەی کە مرۆڤ کەمەندکێشی خۆی دەکات. بەردەوام ئەم پرسیارە لـە مێشـکم دا دەهات و دەچوو: بڵێی هیوای پاکبوونەوە مابێت؟

## تەلەفۆنم بۆ سەیدا کرد:

لـە ئوتێلەکـەوە بـە دوودڵـی و ترسـەوە تەلـەفونم بـۆ سـەیدا کـرد... دەمویست باسـی ئـەو تروسـکە ئومێدەی لەگـەڵ بکـەم کـە نـاخمی گـەرم

کردبووەوە. لەوانەیە ئەگەر لە سەدا یەکیش بێت بیرێك لە من بکاتەوە، چونکە ئێستا ئەو ئیتر سەڵتە.

دایکی وەڵامی دایەوە. خۆمم نەناساند. تەنها ژمارەی تەلەفونەکەمم پێدا. باشتر کە خۆی هەڵی نەگرت. چونکە وەك منداڵ دەخەڵەتام بەو تۆزە هیوایە و هەستەکانم دەدرکاند. حەتمەن بە نەخێر وەڵامی دەدامەوە و ئەو کاتە بەتەواوی دەڕووخام.

من لە گێژاوی ئەم خەیاڵ و بیرکردنەوانەدابووم زەنگی تەلەفونەکە لێی دا. هەڵمگرت و دەنگی سەیدا هاتە بەر گوێم.

ئاه خوایە گیان! زمانم وشکبوو. ئەو وشانەی لە مێشکمدا ڕیزم کردبوون بەجارێك تێکەڵاوبوون و نەمزانی لەکوێوە و بەچی دەست پێبکەم. زۆرم لە خۆم کرد و وتم:

– خۆشحاڵ بووم بە بیستنی دەنگت. ئەمڕۆ چووم بۆ زیارەتی مەولانا.

– پیرۆزباییت لێ دەکەم نیلۆفەر! هەمیشە خواستوومە شتی جوان بکەیت. باوەڕم وایە کە ئەم هیوایەم دەهێنیتە دی. لەو باوەڕەدام کە یەك بە یەك کێشەکانت تێدەپەڕێنیت. هیوام وایە ڕۆژێك بگەیت بەو جۆرە ژیانەی کە شایانی تۆیە. لەبیرت نەچێت کە تۆ کچی باوکێکی شەهیدیت.

خۆمم پێ نەگیرا و دامە پرمەی گریان.. بەدەم هەنسکەوە وتم:

– کەوتووم و ناتوانم دەربێمەوە. کەسێك نییە دەستی یارمەتیم بۆ درێژبکات. توخوا یارمەتیم بدە سەیدا!

ئەویش دەنگی گۆڕا و لەرزەی تێکەوت. وتی:

– من زۆر ویستم یارمەتیت بدەم، بەڵام بەداخەوە تۆ کۆمەڵێك هاوڕێی خراپت هەڵبژارد. واتزانی جوانی هەموو شتێکە. ڕابردوو و بەهاکانیت لەبیرچووەوە. نازانیت ئەوە چەند دڵتەنگی کردم.

– واتە هەموو شتێك تەواو؟

لەڕاستیدا ئەم پرسیارەم سەبارەت بە کەسی خۆی کردبوو، بەڵام ئەو سووربوو لەسەر ئەوەی بیباتەوە سەر ڕەحمەتی ئیلاهی. وتی:

– هەرگیز.. چۆن هەموو شتێك تەواو دەبێت؟ خوای گەورە تا دوایین هەناسە دەرگای تەوبە و لێخۆشبوون و گەڕانەوەی خستۆتە سەرپشت. باوەڕم وایە تۆ بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە لە دەرگانەی خواوەند دەدەیت و پەشیمانی دەردەبڕیت. خوای گەورە میهرەبانە و هیچ پاڕانـاوە و داوایەك ڕەت ناکاتەوە. پاشان دڵنیام تۆ بە ویست و حەزی خۆت ئەو ڕێیەت هەڵنەبژاردووە و، حەزیشت بەو ژیانە نیە. ئیشەڵڵا ئەمانە ڕزگاربوونت ئاسانتر و خێراتر دەکات.

بەدەم گریانەوە وتم:

– سەیدا، ڕاستی بڵێ. وا دەکەیت هیوام بدەیتێ و لەبەر دڵی من وا دەڵێیت یان بە ڕاستە؟ یانی ئەوەندە نزیکم لە دەرگای ئومێدەوە؟

– کەس لە خوا نائومێد نابێت.

– خۆزگە لەو ڕۆژانەدا کە لووتبەرز بووم و بە جوانیمدا دەنازیم، تۆ زیاتر لێم نزیك بوویتایە و ئاگات لێم بوایە. پتر ڕێنیشاندەرم بوویتایە. خۆزگە زۆرت لێ بکردمایە و ئەمڕۆ ئاوا پەشیمان و نائومێد نەبوومایە.

– دەزانیت، من لەو کوڕانە نەبووم کە تۆ بەدوایاندا دەگەڕایت، لەو دۆستە ساختانەشت نەبووم کە ببوونە پەروانەت.

لە کۆتا ڕستەیدا هیوا و ئومێدم بووژایەوە و هەستەکانم هاتنە جۆشان. وتم:

– دەمزانی کە تۆ دۆستێکی ڕاستەقینەیت. بەڵام بۆ زیاتر دڵنیابوون چاوەڕێی نیشانەیەك بووم لە تۆوە..

وەڵامی نەدایەوە. تەنها وتی:

– دوعات بۆ دەکەم.

ئنجا مژدەیەکی دامێ کە خۆشیی یەکەمی دووقات کرد. وتی:

– دەزانیت، سبەی من دێم بۆ قۆنیا. کۆبوونەوەیەکم هەیە لەوێ.

– با یەك ببینین سەیدا. زۆر پێویستم پێتە. تەنها بینینیشت هێزم دەداتێ.

چاك تێگەیشت لە مەبەستم. بەڵام بێدەنگ بوو. تەنها وتی:

– ئاخر کارم زۆر زۆرە.

کاتێك دەسكی تەلەفونەکەم دانایەوە، لەو ژوورە تەنیایەدا هەڵدەلەرزیم. دەتوت جوانترین دیاری دنیا دراوە پێم و لە خۆشیدا فرمێسکم دەڕشت. خۆم دا بەسەر جێگەکەمدا و گریام. تاقە یەك داوام هەبوو لە خوای پەروەردگار: لەم ژیانە ڕزگارم بێت..

بڕیاربوو سبەی بەیانی لە دەرگای ئوتێلەکەدا سەیارەکەم و حیمایەکانم چاوەڕوانم بن. کارێکی ترمان ڕادەپەڕاند و دەگەڕاینەوە بۆ ئەنقەرە.

## لەو ساتەدا کە خەریك بوو ئومێدەوار دەبووم:

لە ئوتێلەکە چوومە دەرەوە. بەدرێژایی شەوی ڕابردوو نوورام لە خەیاڵدابوو. حەزم دەکرد باسی تەلەفونەکەی نێوان من و سەیدای بۆ بکەم و ڕای ئەویش وەرگرم. لەوانەیە لە هەستەکانی من تێبگەیشتایە و هانی سەیدای بدایە بێتە پێشەوە. ئەمە هیوایەکی گەلێك دووربوو، بەڵام دیسانیش دەروونمی ڕووناك دەکردەوە.

خەریك بووم سواری تەکسییەك دەبووم کاتێك سەیارەك بەخێرایی لێمان نزیك بووەوە و دەرگاکانی کرانەوە. هەر ئەوەندەم زانی چواردەورم بە پیاوی چەکدار تەنرا. گرتیانم و منیان کردە سەیارەیەکی ترەوە. دیاربوو حیمایەکانم دەستیان دابوویە چەکەکانیان، بۆیە لە دوامانەوە

دەنگی تەقە هات. بەپەلە منیان لەو ناوە دوورخستەوە. لە دواوەی سەیارەکەدا لە نێوان دوو پیاوی بەهێزدابووم. شۆفێرەکە خۆی کرد بە کۆڵانە تەسك و پێچاوپێچەکاندا و خۆی لە حیمایەکانم ون کرد. شۆفێرەکە ئاوڕی دایەوە و بە یەکێك لە پیاوەکانی وت:

– چی بوو؟

– یەکێکیان لێ تۆپی.

– ئەوە زۆر خراپە. سەرۆك وتی با کەس نەکوژرێت.

– ناچاربووین، نەمانکوشتایە دەستی لێ دەکردینەوە.

پیاوەکان بەهیچ جۆرێك بێڕێزییان بەرامبەر نەکردم و توخنم نەکەوتن. یەکێکیان وتی:

– مەترسە خوشکێ. ئەم ڕووداوە پەیوەندی بە تۆوە نیە. تەنها ڕکەبەریی نێوان دوو دوژمنە. واتە تۆ وەك کارتێکی فشار بەکاردەهێنین. هیچ لە تۆ ناکەین. تۆ میوانیت لای ئێمە.

قۆناغێکی نوێ لە ناڕەحەتی و کێشە بۆ من دەستی پێکردبوو. دڵم خۆش بوو بەوەی تروسکەی هیوام بەدی کردووە، کەچی لەپڕێکدا پەردەیەکی ڕەش بەردەممی داپۆشی. گوناهەکانم ئەوەندە زۆربوون پاکبوونەوەم ئاسان نەبوو. کە لە شاری قۆنیا چووینە دەر، یەکێك لە پیاوەکان وتی:

– ئیش و کاری ئێمە وایە خوشکێ، پێویستە چاوت ببەستینەوە.

ڕاهاتبووم بە ڕفێنران و دزران. بەلایانەوە مرۆڤ هیچ نرخێکی نەبوو. جوان و بەناوبانگ و زانا و نەزان یەك گرنگی هەبوو بۆ ئەوان، ئەویش تا ئەو کاتەی بەرژەوەندییانی تێدابوو. ئەگینا قەت بەزەیی و ڕێز نەدەبوو بە هۆیەك بۆ وازهێنانیان لە یەکێك.

گەیشتینە ماڵێك. بە قادرمەیەكدا سەریانخستم و بردیانم بۆ ژوورێك. كە چاویان كردمەوە دیم پەنجەرەكە بە پەردەی ئەستوور دادراوەتەوە. هەتا بە ڕۆژیشدا گڵۆپەكان داگیرسابوون. پیاوێكی نەناسراو هات و وتی:

– كەمێك ئیسراحەت بكە خوشكێ. گەر پێویستیت بە هەرچییەك بوو بانگمان لێ بكە. دواتر سەرۆكەكەمان دێت و قسەت لەگەڵ دەكات.

دیاربوو سەرۆكەكەیان دوژمنی بەڕێوەبەری كۆمپانیاكەی ئێمەیە. بگرە و بەردەیان بوو لەسەر بەرژەوەندی و من بووبوومە قوربانی.

دەترسام. هەم ترسی گیانم و هەم ترسی لەناوچوونی ئەو هەستە جوانەی كە چەند ڕۆژێكە دنیاكەمی ڕازاندۆتەوە. بە دەنگەدەنگ و جیڕەی نەردەوانە دارییەكەدا زانیم یەكێك سەردەكەوێت. لەوانەیە سەرۆكەكەیان بێت.

پیاوێكی كەتەی ئەسمەری برۆپڕ هاتە ژوورەوە كە هیچ نیشانەیەكی دۆستایەتی لە ڕوخساریدا نەبوو. بە جگەرەكەی دەستیەوە زرم لەسەر كورسییەكە دانیشت. وتی:

– ئێمە تا ئەمڕۆ هەمیشە لە دوورەوە تاقیبی تۆمان كردووە نیلۆفەر خان. بینیم كە بەڕاستی زۆر جوانیت، وەلێ سەرۆكێكی هەڵەت هەڵبژاردووە. تۆ زۆر لەوە جوانتریت ببیتە كەنیزەكی سامییە كەچەڵ! تا ئەمڕۆ ئەوان پارەیان لە تۆ دەكێشایەوە. ئادرێسی ڕاستەقینە ئێمەین. ئیتر لە چنگمدایت. با بزانیت لەمەولا ئەوەی من بیڵێم ئەوە دەبێت.

– من هیچ پەیوەندییەكم بەم كارانەوە نیە. مەمكەنە قوربانی كێشەی نێوانتان. من ئافرەتێكم. ئەزێتدانی ئافرەت شایانی پیاوی مەردی وەك ئێوە نییە.

– مەترسە. كەس پەنجەت بۆ درێژناكات تا تۆ نەتەوێت. دەزانم سەرۆكەكەت بۆ ڕزگاركردنت دێتە سەرمان. ئەڵبەتە بۆ ڕزگاركردنی ژنێك

نا.. تۆ ئاڵتوون و گەوهەریت بۆ ئەوان. بۆیە ناچارە بێت. بەڵام من بیرم لە شتێکی تر کردووەتەوە. ئیتر هی منیت، کەس ناتوانێت لە منت بسەنێت. ئێستاش ئاقڵ ئاقڵ هەوڵ بدە خۆت ڕابهێنیت بە شوێنە تازەکەت.

## چەپەڵیی بەرۆکی بەرنەدام:

ڕووخابووم. تەڵەکانی ژیان بڕانەوەیان بۆ نەبوو. ڕێگر و پاشقولگر و ئەوانەی وەکو خۆراکی ڕاو بەکاریان دەهێنم و، نەخشە و پلانە پیس و خیانەتکارەکان.. بەشی من هەر ئەمانەبوون خوایەگیان؟ لەم دنیایەدا قەت کەسێکی باشم لێ هەڵناکەوێت ؟

هەڵەیەکم کردبوو. گوناهم کرد، بەڵام ئێستا پەشیمانم و دەمەوێت ڕزگارم ببێت. بەداخەوە ڕێییەکان دیسان داخران و هیواکان کوژانەوە. وابزانم ئیتر خوداش منی ناوێت. چونکە من شایانی ئەوەبووم لەناو تاواندا بخنکێم. نەدەبوو لەخۆڕایی دڵم بخەڵەتێنم و ئومێدەواربم. من ئیتر تەواوبووبووم، ژیانێك دەژیام کە هەر لە سەرەتاوە کۆتاییەکەی دیاربوو.

زۆری نەبرد دەنگی تەق و تۆق هات. یا پیاوەکانی سامین یا پۆلیس. لە ترسدا خۆم خزاندە سووچێکەوە. لەقەیەکی بەهێز درا لە دەرگای ژوورەکە. چەکدارێك بەپڕتاو خۆی کرد بە ژووردا، و وتی:

– خوشکێ خێراکە، سەیارەکە لە خوارەوەیە...

بەڵام ئاگای لەوە نەبوو یەکێك لە دواوەیەتی. فیشەکێك بەر کەللەی سەری کەوت و لە خوێنی خۆیدا کەوت.

خوایەگیان! خوێن فیچقەی دەکرد و پەلەقاژەی کرد تا گیانی دەرچوو. بەرچاوم ڕەش بوو و گەدەم تێکەڵ هات. منیش لەجێی خۆمدا کەوتم و بوورامەوە. کە چاوم هەڵهێنا بردبوومیانە ژوورێکی تر. یەکێك وتی:

– شوێنەکەمانیان دۆزیوەتەوە. دەچین بۆ جێ یەکی تر. مەترسە خوشکێ تۆ هیچت نیە.

دوو چەتەی خوێنڕێژ لەسەر من شەڕیان بوو. ئەو بەڵا و ئازار و خەفەتانەی ئەم جوانییە نەفرەتییە بەسەری هێنام کۆتاییان نەبوو.

دیسان بە چاوی بەستراوەوە بردیانم بۆ شوێنێکی تر. دیسان ترس و دڵەتەپێ.. سفرەی گورگان دوایی نەدەهات.

ئەنووکە من چ جیاوازییەکم هەبوو لەگەڵ خزمەتکارێکی بێ نرخدا؟ گوایە شاجوانم. نەفرەت لەو جوانییەی کە وابێت. خۆزگە شای ناشیرینان بوومایەوە و کەس سەیری نەکردمایەوە، بەڵام بە حەیا و حورمەتی خۆمەوە بژیبامایە. هیچ نەبێت ویژدانم ئاسوودە و ناخم پاك و ڕۆحم بێ لەکە دەبوو.

مەگەر نەمدەویست خانمێك بم لە ماڵەکەی خۆمدا؟ نەمدەخواست تامی بەختەوەری بکەم لەگەڵ مێرد و منداڵەکانمدا؟ مەگەر نەمدەویست لە جێ یەکدابم دەوروبەرم ڕێزم بگرن و گرنگیم پێبدەن و بە مرۆڤم دابنێن؟

چۆن نەمدەویست؟ چۆن؟ لەبری ئەم ژیانە ئامادەبووم ژنێك بم هەموو ڕۆژێك لێدان بەدەستی مێردەکەم بخۆم و، لە ماڵەوە بەند بکرێم و ئنجا ئێواران ئاشت بکرێمەوە و دڵم بدرێتەوە. بەڵام بەداخەوە ئەوە قەدەری من نەبوو..

هەمیشە خەیاڵی جوانی من ئەوە بووە منداڵێکم دەستم بگرێت. کۆرپەیەکم هەبێت بیگرمە باوەش. مێردێکم هەبێت لە دڵەوە بمدوێنێت. تەنانەت ڕازیش بووم بە خەسوویەك کە خۆشینەوێم، هەمیشە بە تێهەڵدانم بدات لای مێردەکەم. بەس ئەوەندەی لەم گێژاوە ڕزگارم ببوایە !

لەو ماڵەدا کە بەند کرابووم هێواش هێواش هەستم بە نزیکبوونەوەی مەرگ دەکرد. بەهەزار تکا و ڕجا ڕادیۆ شڕەیەکیان دامێ. گوێم لە بەرنامەیەك دەگرت لەسەر خێزان. هێشتا لە کۆڵانە داخراوەکاندا بەدووی دەلاقەیەکی هیواوە بووم.

## ژیانی خێزانیی بە ئیمان دەبوژێتەوە:

لە بەرنامەکەدا باسی کاریگەری باوەڕ دەکرا لە ژیانی خێزانییدا. باس لەو ئیمانە دەکرا کە سالآنێك لەوەوپێش من نرخیم نەزانی و فڕێمدا. پێشکەشکارەکە دەیوت:

– ئیمان و خێزان دوو دەستەخوشکی دانەبڕاو و دوو چەمکی یەکتر تەواوکەرن. لەم بارەیە مامۆستا سەعیدی نوورسی دەفەرموێت:" بەڵام هەر ئەوەندەی ئیمان بە ڕۆژی دوایی ئەو ماڵە بەسەر بکات، ئەوا یەکسەر هەموو شوێن و سووچ و لایەکی ئەو ماڵە ڕووناك و ئاوەدان دەکاتەوە. چونکە ئەو کاتە پەیوەندییەکانی خزمایەتی و کەسایەتی و میهرەبانی و خۆشەویستی ناو ئەو ماڵە، لە چوارچێوەی ژیانێکی کورتدا لێك نادرێتەوە و پێیەوە نابەسرێتەوە، بەڵکو بە چەند پەیوەندییەکی وا دەپێورێن و لێکدەدرێنەوە کە هەر لە دنیاوە تا دەگاتە نەمری و مانەوە و بەختەوەری هەمیشەیی لەو دنیادا، درێژەی هەیە و بەردەوامە. ئیتر هەریەك لەو خێزان و خزمانە ڕێزی بێگەردی ئەوانی تر دەگرێت و، بە چەشنێکی خاوێن خۆشی دەوێن و ، میهرەبانییەکی ڕاست و برادەرییەکی بەوەفا و ئەمەکداریان لەگەڵدا دەنوێنێت و، چاو لە کەمتەرخەمییان دەپۆشێت. لە ئەنجامی ئەمەشدا ڕەوشتی مرۆڤانەیان بەرزدەبێتەوە و، بەختەوەری ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی لەو ماڵەدا ڕەنگ دەداتەوە."[1]

چونکە ئەو ژن و مێردەی باوەڕیان بە زیندووبوونەوە و ژیانی هەمیشەیی هەیە، پێکەوەبوونیان تەنها بەم دنیایەوە نابەستنەوە.

---

١– سەرجەمی پەیامەکانی نوور، تیشکەکان، (لا ٣٧٥). لە دانراوەکانی زانای گەورەی کورد مامۆستا سەعیدی نوورسی. دەقی کوردی ئەم پارچەیە لە وەرگێڕانەکەی مامۆستا فارووق ڕەسووڵ یەحیاوە وەرگیراوە. (وەرگێڕ)

هاوڕێیەتییان بەم ژیانە کورت و فانییەوە سنووردار نابێت. هەردووکیان دەزانن کە لە ئەبەدیەتیشدا هاوسەری یەکترن.

ئاراستەی ژیانیشیان بەپێی ئەمە دیاری دەکەن. لە ڕێگایەك دەگەڕێن ئەوین و خۆشەویستی نێوانیان تا ئەبەد بهێڵنەوە.

بەپێچەوانەی خێزانێکەوە کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نییە، خۆشەویستی و گرنگی پێدان و ڕێز و گەرموگوڕی لەرزەی پێدەکەوێت. ئەوەی دەیکەن لەبەر خاتری خوا نایکەن. تەنها بیر لە نەفسی خۆیان دەکەنەوە. بەئاسانی لەپێناو چێژ و سوودی خۆیاندا هەموو شتێك دەکەن. ئەوکات لەو خێزانەدا ئاسوودەیی باردەکات. چەندەها ژن و پیاو و منداڵی لەژمارەبەدەر لە ئازاردا دەتلێتەوە. هەرکەسێك لە هەرکاتێکدا ویستی ماڵ جێدەهێڵێت و شوێن بەختەوەری خۆی دەکەوێت.

دەڕوات، بەڵام ئایا ئەوەی دەڕوات بەختەوەر دەبێت؟ ئایا بیری ژیانی ناو خێزان ناکات کە لە دەستی داوە؟ خێرا ژنە چاو پڕ لە فرمێسك و منداڵە بێنازەکانی لەبیردەچێتەوە؟ چەندێك بیەوێت بەزەیی و میهرەبانی لە دڵی دەربکات، ئەوەندەی تر ئاگری مەعنەوی دەیسووتێنێت. بۆ کوژاندنەوە و لەبیرچوونەوە خۆی دەداتە دەست ڕابواردن. لەوانەشە ماوەیەك لەبیری بەرێتەوە. بەڵام شیرینییەکی کاتییە و لەکۆتاییدا دەبێت بە ئازار و خەم.

ئەو ژەهرەی لەگەڵ هەنگوینەکەدا خوراوە کاریگەرییەکەی دەردەکەوێت. ئیتر ئازارەکان دەست پێدەکەن. دەیەوێت دڵی خۆی بداتەوە و خۆی بخەڵەتێنێت. بە دڵشکاوییەوە برەو بە ڕاکەڕاك بەشوێن ژیاندا دەدات، وەلێ نازانێت خۆشییەکانی دنیا تراویلکەیە. ئەگەر دەستیشی پێیان بگات تەنها تامێکە و تێربوونی نیە. تەنها چێژێکی کاتی دەدات. پاش ماوەیەك سەدەها قات ئازار دەرخواردی مرۆڤ دەدات.

بەکورتی چێژە نامەشروعەکانی دنیا وەك هەنگوینی ژەهراوی وان. پاش کەمێك پێچی ئێش بە سکی ئەوانەدا دێنێت کە تامیان کردووە. چونکە سروشتی دنیا وایە، تا هێشوویەك ترێت دەداتێ دە زللەی بەسوێت تێدەسرەوێنێت.

لەم بارەیەوە سەعیدی نوورسی دەفەرموێت:

" مالی هەموو مرۆڤێك دنیا بچووکەکەیەتی، بەڵکو بەهەشتە بچووکەکەیەتی.. جا ئەگەر ئیمان بە ڕۆژی دوایی تیایدا زاڵ نەبێت و باڵی خۆی بەسەر بەختەوەری ئەو ماڵەدا ڕانەکێشابێت، ئەوا هەموو ئەندامێکی ئەو خێزانە سەبارەت بە پەیوەندییەکانی نێوانیانەوە، دووچاری نیگەرانییەکی ئاوێتەی ئازار و ئەشکەنجەیەکی دژوار دەبێت، ئەمەش بە ئەندازەی پلەی ئەو خۆشەویستی و دڵسۆزی و میهرەبانییانەی کە لە نێوان کەسانی ئەو خێزانەدایە. ئیتر ئەو بەهەشتەیان لێ دەبێت بە دۆزەخێکی وا کە گوزەرانی تێدا سەخت و ئەستەم بێت، دوور نییە لەتاو ئەو بارە ناهەموارە ژیری خۆی بەنج بکات و پەنا بەرێتە بەر کاری هەرزە و کاتی."[1]

گەر ئەم ئامانجە بکرێت بە بناغەی خێزان، ئەوکاتە تاکەکان هەوڵ دەدەن ئەم جیهانبینییە لەو خێزانەدا بژیێنن. ئاسوودەیی و بەختەوەری کە دوو چەمکی سیحری و تەمومژاوی دیارن، لەم ڕێیەوە بە ئاسانی بەدەست دێن.

---

١- سەرجەمی پەیامەکانی نوور، تیشکەکان، (لا ٣٧٤). لە دانراوەکانی زانای گەورەی کورد مامۆستا سەعیدی نوورسی. دەقی کوردی ئەم پارچەیە لە وەرگێڕانەکەی مامۆستا فارووق ڕەسووڵ یەحیاوە وەرگیراوە. (وەرگێڕ)

تا دەهات هیوا بڕاوتر دەبووم:

چیتر من هیوای ڕزگاربوونم نەبوو. نەشمدەتوانی بەرگەی ئەو ژیانە تاریك و زبر و بێ هەستە بگرم. چیم بکردایە؟ لەو ڕۆژانەدا ئەو ئومێدە گچکەیەش کە هەمبوو ڕووی لە کوژانەوە دەکرد. لە تاریکییەکی ڕەهادا مامەوە. نەمدەزانی کەی بەیانییە و کەی ئێوارەیە. نازانم چەند شەو و چەند ڕۆژ تێپەڕیبوو. تەنها شتێکم دەزانی: کۆتایی نزیك بوەتەوە و لە کۆڵانی داخراودام و خەیاڵەکانم با بردنی.

دەرگاکە کرایەوە. پیاوێکی قەبەی ناشیرین خۆی کرد بە ژووردا. وتی:

– سەرۆك تۆی دەوێت.

نەمدەتوانی سەرپێچی بکەم، چونکە پێشتر ئەنجامی گوێ نەگرتنم ئەزموون کردبوو.

بەدوایدا چوومە دەرەوە. بردیانم بۆ ژوورێکی تر. ژووری نووستن بوو. دیاربوو دڕندەیەك چاوەڕوانی ڕاوەکەیەتی. خۆمم دا بە ئەرزەکەدا و زریان و تۆفان ڕوویان لە ناخم کردبوو. هەموو خانەکانم و هەستەکانم هەستابوونە سەرپێ و دژایەتییان دەکرد. قیژاندم:

– نەخێر، بەسە ئیتر.. مردن لەمە باشترە!

بەڵێ. مردن لەوە باشتربوو. چونکە مەرگ پاکبوونەوە و ڕزگاربوون بوو. لەپڕێکدا دڵم هات بەیەکدا و وەك ئەوەی یەکێك دەستی لە بینم گیرکردبێت هەناسەم گیرا. وەك کۆتا پەلەقاژە تا هێزم تێدابوو قیژاندم:

– فریام بکەوە خوایە گیان! وەرە بە هانامەوە. لە هەر کوێیت ئیتر وەرە. تۆ بەندەت تەنیا ناکەیت. من ئەم گوناهانەم ناوێت، بەزۆر پیسم دەکەن. وەرە و ڕزگارم بکە. وەرە و..

لەناکاو بەرچاوم ڕەش بوو. بە دەنگێکی تاقەت پڕووکێن لـە مێشـکمدا لە هۆش خـۆم چـووم. ئـیتر دوای ئـەوەم بیرنایەتـەوە. چـەند ڕۆژ و چـەند سەعات تێپەڕی نازانم.

## گۆتایی ژیانم دەبینـرا:

کاتێك هاتمەوە هۆش خۆم پۆلیسێك دەیقیڕاند:

– چوورانم کاکی دکتۆر، شەو لە بەردەم خەستەخانەدا فڕێیـان داوە و ڕۆیشتوون. نە نزیکێکی لەگەڵدایە و نە هەویەیەکی پێیە.

تێگەیشـتم لـە نەخۆشـخانەم. دیسـانیش ئـەو چـەتە و خوێنڕێژانـە – بەشـکم خـوا بیانهێنێتـە سـەر ڕێـی ڕاسـت– دەیـانتوانی بمکـوژن و لـە سووچێکدا تووڕم بـدەن. هـیچ نـەبێت لەبـەردەم نەخۆشـخانەیەکدا فڕێیـان داوم.

خۆزگە بیانکوشتمایە و لە ژیاندا نەدەمام ، ئیتر هەرگیز ترسی گیران و فڕێنرانم لەگەڵدا نەدەما.

دکتۆرێك هات بۆ لام. بەوردی لێی ڕوانـیم. خـەریك بـوو دەیناسـیمەوە بەڵام بەتەواوەتی دڵنیا نەبوو. چونکە حەتمەن لە دڵی خۆیـدا وتوویـەتی:" لە کچە بەناوبانگەکە دەچێت. بەڵام ئەگەر ئـەوە ئـەی کـوا حیمایـە و دار و دەستەکانی؟". وتی:

– کەست نییە؟

– نەخێر.

– ئێمە ناتوانین ئاوا چارەسەرت بۆ بکەین. تۆ نەخۆشـیت و پێویسـتە بەپەلە بخرێیتە ژێر چاودێری وردەوە.

بازنەکەی دەستم دەرهێنا و وتم:

– با ئەمە بفرۆشن و بە پارەکەی..

- نابێت، عەیبە بۆ ئێمە بازنی نەخۆش وەرگرین. خەمت نەبێت من چارەسەرت دەکەم. هێشتا کەسانی خێرخواز لەم دنیایەدا ماون.

کەوایە خوا بەندەی چاکەکاری واشی هەیە. یا لە ملیۆنێکدا یەکن، یا زۆرن و قەت بەر من ناکەون..

دکتۆرەکە زۆر خەریکم بوو. چەندەها تیشکی سینی بۆ گرتم و چەند تاقیکردنەوەیەکی بۆ ئەنجام دام.

دوای دوو ڕۆژ هات و لە تەنیشتمەوە دانیشت. وتی:

- دڵنیایت کە کەست نییە؟

- بەڵێ..

زۆری بەلاوە سەیربوو. لەوانەیە وتبێتی چۆن ژنێکی هێندە گەنج و جوان بە تەنیا جێدەهێڵرێت. وتی:

- حەزم دەکرد مژدەیەکی خۆشت پێ بدەم، بەڵام بەداخەوە ناتوانم. هاوڕێیەکی ژیانت بۆ هاتووە کە زۆر باش نیە. هاوڕێیەتی کردن لەگەڵیدا گران و زەحمەت و بەئازارە. وەلێ دەتوانی بە ئارامگرتن و پشت بە خوا بەستن لەگەڵی هەڵبکەیت. ئیشەڵڵا ئەگەر شەوقی ژیانت تێدابێت بە سەریدا سەردەکەویت. بەڵام ئەگەر تووشی کۆڵەواری و نائومێدی ببیت...

تەواوی نەکرد. هەواڵێکی خراپ هەبوو کە لە دەمی دکتۆر نەدەهاتە دەر و لە گەرووی گیرابوو. وتم:

- شەرم مەکە کاکی دکتۆر. ئامادەم هەموو شتێك ببیستم. کەسێك ژیانی لەگەڵ عەزرائیلدا بەسەربردێت، لە هیچ شتێك دەترسێت؟ بیڵێن تکایە، نەخۆشییەکەم چیە؟

- شێرپەنجەت هەیە خوشکێ. شێرپەنجەی ئێسقان. واتە ئێسقانەکانت خوێن دروست ناکەن. چارەسەری هەیە. پێویستە ئێسقانی

گونجاوی ترت بۆ بگوازرێتەوە. هەندێك لەوانەی ئەم نەخۆشی یە دەگرن ڕزگاردەبن.

– شێرپەنجە؟؟

قەت بە خەیاڵمدا نەهاتبوو، هەرگیز بیرم لێ نەکردبووەوە. ژیانم جارێکی تریش ڕووخایەوە. هەرگیز نەمدەزانی کۆتایی ژیانی پێچاوپێچ و پڕ کێچەڵم بەو شێوەیە دەبێت. هەموو هیواکانم پووکانەوە. تێگەیشتم کە جارێکی تر ناکەومەوە سەر پێی خۆم و پەیوەندی نێوان من و ژیان بچڕاوە.

لە نەخۆشخانە دەرچووم. سەرم دا لە بانق، بەڵام بێهوودە بوو. هەموو پارەکانمیان بردبوو. نیلۆفەر کە ساڵانێك کرابووە تاجی سەران و، بە حیمایەوە دەڕۆیشت و ستایش دەکرا و، گۆرانی بۆ جوانییەکەی دەوترا، ئەنووکە بێ پارە و بێ کەس لە کۆڵانەکاندا جێماوە.

# بەشی پێنجەم

## ڕۆژە دژوارەکانم



بازنەکەم فرۆشت. دەبوو جێیەك بدۆزمەوە سەرمی کز تیابگرم یان شوێنێك تێیدا چاوەڕێی مردن بکەم..

ژێرزەمینی بینایەکم بەکرێ گرت کە خۆر نەیدەگەیشتێ و بۆنی لێ دەهات و شێدار و تاریك بوو. وتم سوپاس بۆ خوا. هیچ نەبێت شوێنێکم دیوەتەوە کە دەتوانم تێیدا بمرم. لە کوێوە بۆ کوێ؟ کۆتا وێستگەی شاجوانێك کە جاران میوانی ئوتێلە پێنج ئەستێرەییەکان بوو..

لە دنیای تاریکمدا نوقم بووبووم. ڕۆژان و شەوان و مانگەکان بەئازارەوە بەسەرمدا تێدەپەڕین. پێویستم بە چارەسەر بوو، بەڵام بەندەیەکی خودا نەدەهات دەرگاکەم بکاتەوە.

بۆ من هەموو شتێك تەواوبووبوو. هیچ چاوەڕوانییەکم نەبوو لە دنیا و ژیان و مرۆڤەکانی دەوروپشتم. کەسیشم نەمابوو لە دەرگام بدات. ئیتر بە تەنیا لەوماڵەدا کە لە گۆڕ دەچوو و بەئەستەم دەمتوانی هەناسە بدەم و، ئازارم دەکێشا.

ئەو ڕووداوە تاڵانەی بەسەرم هاتن لەگەڵ تەنیایی و نەخۆشی، یەکیان گرت و بەجارێك هێزی بەرگری منیان ڕووخاند. لە خۆمم دەپرسی:" ئیتر بۆچی دەژیم؟ هۆیەك هەیە بۆ ژیان؟".

باوك و دايكێكم نەبوو لەدڵەوە خۆشيانبوێم.. مێردێكی وەفادارم نەبوو تەمەنێكم لەگەڵ بەش بكات. هيوايەكم نەبوو داهاتووم ڕووناك بكاتەوە. ڕابردوويەكم نەبوو ڕووم بێت بە سەربەرزييەوە بەنێو خەڵكدا بگەڕێم. جوانی بوو بە بەڵای گيان و گۆڕا بە ناشيرينی و خەم. تەنانەت ئێواران پارچەيەك نان و قومێك چا و كلۆيەك شەكرم دەست نەدەكەوت. كرێی چەند مانگێكم نەدابوو. چيتر دەرمانەكانيشم تەواوببووبوون و شتێكم نەبوو بۆ هێوركردنەوەی ئازارە تاقەت پڕووكێنەكانم.

كەوايە هۆيەك نەبوو بۆ بەرگەگرتنی ئەم ئازارانە و درێژەدان بە وەها ژيانێك. وابزانم كاتی ئەوە هاتووە كۆتايی پێبهێنم. درێژەدان بەم ژيانە چيتر مانايەكی نيە.

بەسە ئيتر بەسە. زامی ڕۆحم لە برينی جەستەم بەسۆترە. نەمدەتوانی لەوە زياتر بەردەوام بم.

چەندەها جار هات بە خەياڵمدا بچم تەلەفون بۆ نووری و سەيدا بكەم. بەڵام ئەو بيرەشم خستە كەنارەوە. ئومێدم بە كەس نەبوو.

كەوتمە سەر ئەژنۆ. هەموو گيانم دەلەرزی. زۆر بێچارەبووم. پاڕامەوە: " خوايەگيان! باوەڕم بە بوونی تۆ هەيە، بەڵام دوای ئەم هەموو گوناهە ناتوانم بۆ لات بگەڕێمەوە. ناتوانم بێمە حزووری پاك و پيرۆزت. ناتوانم ناوت بهێنم و لێت بپاڕێمەوە. چونكە نە ڕووم هەيە و نە هێز. ئەگەر دەتەوێت يارمەتيم بدەيت ئەم گيانەم لێ بسێنە. ئەگينا خۆم دەستم تێی دەچێت.

خۆزگە دەمتوانی پێت بڵێم ڕزگارم بكە! خۆزگە دەمتوانی بڵێم يارمەتيم بدە، بەڵام ناتوانم! چونكە گوناهەكانی ڕابردووم ناهێڵن. نامەوێت بێ ڕێزيت بەرامبەر بكەم. تۆ گەورە و پيرۆزيت. منيش بەندەيەكی ناپاك و

تاوانبار.. چۆن ڕووم بێت دوای هەموو ئەوانەی کردم بێمە حزوورت و داوای لێخۆشبوونت لێ بکەم؟

گەرچی دایکی ڕەحمەتیم دەیوت:" کاتێك کەوتیتە تەنگانەوە بەشوێن یارمەتیدەرێکدا مەگەڕێ کچم. پەنا بە خوای جیهانیان بگرە. ئەو مەزنترین ڕزگارکەرە. چەندێك گوناهت زۆربێت دەرگای ئەو هەمیشە کراوەیە. لەو دەرگایە بدە. گوێت لێ دەگرێت و یارمەتیت دەدات. خاوەنی میهرەبانی و بەزەییە. ئەو هەرگیز بەندەکانی لە تەنگانەدا بەتەنیا جێناهێڵێت".

باوەڕم بەمە هەیە. بێگومان ڕاستە، بەڵام من ڕاست نیم. من پاك و دروست نیم. من هەمیشە سەرپێچیم کردیت. هیچم نەکرد لەوانەی فەرمانت پێدا. تەمەنم بە تاوان بەسەربرد.

ئێستا لە تەنگانە و گێژاودام. بە چ ڕوویەکەوە بێمە بەردەمت؟ ئەی ئەو ڕۆژانەی لەشساغ و دەوڵەمەند و بەکەیف بووم لەکوێ بووم؟ تۆ پێم ناڵێیت:" ئێستا کە بێچارەیت و ناچاریت دێیت؟".

هێزم نەماوە. چیتر نە دەتوانم بپاڕێمەوە و نە داوای لێبووردن بکەم. من تەواوبووم و بەسەرچووم. چارەیەکی ترم نیە. دەبێت لەم گۆڕە بێمە دەر کە پێش مردنم تێی کەوتووم.

## هیچ چارەیەکم نەمابوو جگە لە خۆکوشتن

لە چواردەوری خۆمم ڕوانی. پێویستیم بە هێرشێك بوو. دەبوو پێش ئەوەی ئێوارە دابێت و ئازاری بەسوێ بەربێتە گیانم، ئەو کارەم تەواوبکردایە..

چاوم چووە سەر ڕۆژمێرەکە بە دیوارەکەوە. خاوەنی دەرمانخانەکەی سەر سووچەکە پێی دابووم. دوکانەکە ئافرەتێکی لەسەر بوو. پێشتریش منی دەناسی. زۆر یارمەتی دام لە داو و دەرمانەکاندا، خوا لێی ڕازی بێت. ئافرەتێکی دیندار و پاك بوو..

ژمارەی تەلەفون بەسەر ڕۆژمێرەکەوە بوو. بەزۆر لەجێی خۆم بـزوام. دەمویست تەلـەفون بکـەم و داوای دەستەیەك دەرمـان بکـەم. دەمویسـت بەجارێك بیانخۆم و کۆتایی بە ژیانم بهێنم.

دەسکی تەلەفونەکەم گرت بە دەستمەوە. ئیتر ڕێك نـازانم ژمارەکـانم لێدا یان نـا، لەگـەڵ ئافرەتەکـە قسـەم کـرد یـان نـا. چونکە لـەو کاتـەدا ڕووداوێکی نائاسایيم بەسەرهات.

دایکم... دایکی ڕەحمەتیم هاتە بەرچاوم. چاوە تەڕ و پڕ میهرەبـانی و نیانەکانی لێم دەپاڕانەوە. وتی:

" هەمیشە لەگەڵتدام کچم. هەردەم دوعات بۆ دەکەم. هـەوڵ بـدە. لـە خوای خۆت نزیك ببەوە ڕزگارت دەبێت. نەکەی ئەو کارە شێتانەیە بکەیت. ژیانی هەمیشەییت وێران دەکـەیت. لەبـەر ژیـانی ناشـیرین و پـڕ لـە تـاوان کۆتایی بە تەمەنی خۆت مەهێنە. لەبیرت نەچـێت خـوای گـەورە چاوەڕێی ئەوەیە بەندەکانی داوای لێخۆشـبوونی لـێ بکـەن و جـارێکی تـر نەچـنەوە سەر ئەو گوناهانە.

دەی هێز بدە بەر خۆت. ڕوو بکە خوا.. تۆبە بکە. هێشتا هەموو شتێك تەواو نەبووە. گەر ئەو بیەوێت لە تەنگانەترین سـاتەوەختدا یارمەتیـدەرێك دەنێرێت. خوای گەورە شەهیدان و پیاوچاکان دەنێرێت بۆ بەهاناوەچوونی بەندەکانی".

لە چاوتروکاندنێکدا دایکم لەبەر چاوم ونبوو.

خـۆم لەخۆمـدا بـێ هێـز و بێچـارەبووم و بەهـەزار حـاڵ بـەپێوە خـۆم گرتبوو. کە دایکمم بینی تـەواو بڕسـتم لـێ بـڕا و کەوتمـە سـەر فەرشـەکە. لەبـەر خۆمــەوە دەمنووزانــد:" توخــوا خوایــەگیان ڕزگــارم بکــە! لــەم کۆتاییەی تەمەنمـدا مەهێڵـە هەڵەیـەکی تـریش بکـەم. هـیچ نـەبێت لەبـەر خاتری دوعاکانی دایکم ڕێیەکم نیشان بدە. من زۆر گوناهبارم. هەڵەی زۆرم

کرد. نەمتوانی بەندەیەك بم شایانی تۆ. ئێستا بێچارە و بێکەسم. هێزم نیە و کۆتا دەرگانەم تۆیت. توخوا یارمەتیم بە. ئەگەر دەرگام لێ نەکەیتەوە ئیتر بەرگە ناگرم".

نازانم چەند گریام و نالاندم. تەنها شتێك کە دەمزانی ئەوەبوو کە خوای گەورە ڕزگارکەر و یارمەتیدەرمە و منیش بەندەیەکی هەژار و زەبوون... ناخم دەسووتا و دڵم هاتبووەوە یەك و لە قووڵایی دڵمەوە دەپاڕامەوە. تەنها ئومێدم ئەوبوو. دەرگای لێ نەکردمایەتەوە دەستم دەچووە گیانی خۆم.

بیرم نایەت چەند کڕووزامەوە و لەسەر ئەرزەکە ئەمدیو ئەودیوم کرد. کە هاتمەوە هۆش خۆم بێحاڵ و پەرێشان بووم. لێوەکانم وشك هەڵاتبوون، وەلێ تاقە ئومێدێك لە دوورەوە بەکزی خۆی دەنواند.

## ئای خوایە گیان!

کاتێك لەسەر یەك زەنگی دەرگایماڵەکەم لێ دەدرا، شڵەژام. وتم حەتمەن ژنی دەرمانخانەکە حەپەکانی هێناوە. بەڵام من تەلەفونم کرد؟ بیرم نایەتەوە. ئەگەر ئەو نەبێت خاوەن ماڵەکەیە و هاتووە بۆ کرێکەی. وەك منداڵێك کە تازە فێری گاگۆڵکێ دەبێت تا لای دەرگاکە خۆم کێش کرد. هەر لەگەڵ دەرگاکەم کردەوە کچێکی جوانی داپۆشراوم بەدی کرد. حەڤدە یان هەژدەساڵێك دەبوو. ڕووناکی لێ دەبووەوە.

ئاە خوایەگیان! کەسی ئەوەندە جوان و کاریگەرم نە لە ژیانمدا دیوە و نە لە گۆڤار و تەلەفزیۆنەکاندا بەرچاوم کەوتووە. وەستانەکەی وەستانێك بوو سنووری جوانی تێپەڕاندبوو، مرۆڤی مەست دەکرد و وزەی پێدەبەخشی. وەك ئەوەی سیحری لێ کردبم بە واقوڕماوی سەرنجم دەدا.

پێش ئەوەی من پرسیار بکەم بە دەنگێکی شیرین کە مرۆڤی هێور دەکردەوە و ئارامی دەبەخشی، وتی:

– تۆ داوای دەرمانت کردووە، وا نیە؟

– بەڵێ..

– من دەرمانێکی مەعنەویم بۆ هێناویت کە زامەکانت تیمار دەکات.

– فەرموو وەرە ژوورەوە!

– کاتم نیە. هەر دەبێت ئێستا بگەڕێمەوە. بەڵام سوپاست دەکەم. دەزانیت، تۆ ژیانی منت ڕزگار کرد و قەرزارتم. دەستم بدەرێ با ماچی بکەم.

دانەویەوە و دەستمی گرت. ئاە خوایە گیان! چەند جوان بوون ئەو دەستانە. ئاسەواری پیسی و گوناهیان پێوە نەبوو. دەتووت ئاوێنەیەکی سافە و ڕووناکی دەداتەوە. تا دەهات پتر سەرم سووڕدەما. وتی:

– بیرتە؟ چەند ساڵێك لەمەوپێش لەسەر ڕێگەکەتدا ڕووداوێکی هاتوچۆ ڕووی دابوو. کچێکی خوێناوی لە کەناری ڕێگەکەدا کەوتبوو. ئەو کچە بریندارەت کردە سەیارەکەتەوە و بردت بۆ خەستەخانە. بەرپرسانی نەخۆشخانەکە ئامادە نەبوون وەری بگرن چونکە بیمەی کۆمەڵایەتی نەبوو. تۆش پارەی چارەسەرییەکەت دا.

– بەڵێ، بیرم دێتەوە. چیم پارە پێبوو دام.

بە سەرسوڕمان و عاجباتیەوە لێم پرسی:

– ئەی تۆ چۆن ئەمانە دەزانی؟

– من ئەو کچەم. ژیانی منت ڕزگارکرد. زۆر هەوڵمدا بتدۆزمەوە و بتبینم.

کەمێك خۆم کۆکردەوە، بەڵام هێشتا لە سەرسووڕماندابووم. وتم:

– تۆ کێیت؟

وەڵامی نەدامەوە. پاکەتەکەی دەستی پێدام. وتی:

– ئەم کتێبە وەکو دەرمان وایە. منیش یەکێکی ناو ئەم کتێبەم. ڕاستتر بڵێم من لە پلەی چوارەمی ژیاندا دەژیم کە لەم کتێبەدا باس کراوە. نائومێد مەبە لە خوا. دەوا دەدات بە دەرد و شیفا دەدات بە نەخۆشی و بەندەی تەنگاوی خۆی ڕزگاردەکات.

دیسان دەستی گرتم و، وتی:

– خوا ئاگای لێت بێت! هەمیشە دوعات بۆ دەکەم.

پشتی هەڵکرد و بەپەلە بەسەر قادرمەکاندا سەرکەوت. منیش بەخێرایی کەوتمە شوێنی. قیژاندم:

– مەڕۆ توخوا!

هێشتا دوو پلە سەرکەوتبووم کە ڕووبەڕووی کچی خاوەن ماڵەکەم بوومەوە. ئەو بۆ ژێرزەمینەکە دادەبەزی. بە شڵەژاوی و سەرسووڕمانەوە هاوارم کرد:

– ئەوە بۆ کوێ چوو ئەو کچە؟

– کام کچ؟

– تۆزێك پێش ئێستا سەرکەوت، حەتمەن تۆ دیوتە.

بە سەرسووڕمانەوە وتی:

– من کەسم نەدیوە. وا دیارە زۆر نەخۆشیت.

## کتێبی مەکتوبات و سەعیدی نوورسی:

لەجێی خۆمدا وشك بووم. بەڵێ، من نەخۆش بووم. زۆر بێ هێزبووم، بەڵام خوای گەورە هەلێکی خستبووە بەردەمم.

ئەو کچە کێ بوو؟ خەڵکی کوێ بوو؟ چ کتێبێکی هێنابوو؟ یانی چی ئەو لەناو ئەو کتێبەدا دەژی؟

وەك ئەوەی لە هۆش خۆم چووبم لەسەر زەوییەکە پاڵکەوتم. دەبوو بە مێشکێکی سافەوە لێکدانەوە بۆ ئەم ڕووداوە بکەم و لە ماناکەی بگەم.

دەبوو لە کوێوە دەستم پێبکردایە؟

سەرەتا پاکەتەکەم کردەوە. کتێبێکی تێدا بوو. کتێبێکی بەرگ سووربوو بەناوی (مەکتوبات)[1]. سەعید نوورسی نووسەرەکەی بوو...

بەڵێ، ناوێکی وام بیستبوو. پەیامەکانی نوور و سەعید نوورسیم لە دایکمەوە بیستبوو. کچەکە پێی وتم:" من لەناو ئەم کتێبەدا دەژیم". چونکە کتێبەکە تەفسیری قورئان بوو نەمدەتوانی دەستی بۆ ببەم. من چەپەڵ و گوناهباربووم. دەبوو هەستم و خۆم بشۆم و دەستنوێژێك بگرم، ئنجا بیگرمە دەستم.

ئاە خوایەگیان! دەستنوێژ گرتن؟؟ ئەو هەستە شیرینە بە گشت گیانمدا بڵاوبوویەوە و بردمی بۆ هەرێمی مەعنەوی و ئارامی خۆی.

دەستنوێژگرتن و پاکبوونەوە.. ئاخ خۆزگە هەموو شتێك ئەوەندە ئاسان دەبوو! دەستنوێژێك ئەم هەموو تاوانە چۆن بشواتەوە؟

نازانم لە کەیەوە دەستنوێژم نەگرتووە. ئەوە هیچ کە ساڵانێکە نوێژم نەکردووە. من لە کوێ و پەرستش لە کوێ؟..لەمێژبوو لە بیرم چووبوونەوە. هەستامە سەرپێ. دەتووت بیرۆکەی دەستنوێژگرتن سەرلەنوێ گیانی پێداومەتەوە. کە چوومە بەر دەستشۆرەکە هەموو گیانم دەلەرزی. هەرکە دەستم خستە بەر ئاوی بەلوعەکە شتێکی سەیرم بەسەرهات. دەتووت ئەوە ئاو نییە، بەڵکو دەرمانێکە بۆ لابردنی ئازارەکانم. ئەو ئاوەی دەیدا لە دەستم پیسیی ناخ و نائومێدیمی سڕییەوە. ئاە خوایەگیان! ئەمە ئەو ئارامییە بوو کە بە دوویدا وێڵ بووم. ساڵانێك خەونم بە بەختەوەرییەکی ئاواوە دەبینی. حەز و چێژێك دەڕژانە

---

[1]- مەکتوبات بەرگی دووهەمی سەرجەمی پەیامەکانی نوورە و لە دانراوەکانی زانای گەورەی کورد سەعیدی نوورسی یە. مامۆستا فارووق ڕەسووڵ یەحیا کردوویەتی بە کوردی (وەرگێڕ)

ناخمەوە کە لە هیچ جێیەکی تر دەستم نەکەوتبوو.دەستنوێژم گرت. کتێبەکەم گرت بە دەستەوە و لاپەڕەکانیم هەڵدایەوە. بڕیارم دا لە سەرەتاوە بیخوێنمەوە. کتێبەکە بە مەکتووبی یەکەم دەستی پێدەکرد. لە یەکەم لاپەڕەیدا پرسیارێك هەبوو.

" ئایا حەزرەتی خضر – درودی لەسەربێت – لە ژیاندا ماوە؟ ئەگەر ئێستا لە ژیاندایە، ئەدی بۆچی هەندێ زانای بەڕێز دان بە ژیانیدا نانێن؟

وەڵام: حەزرەتی خضر لە ژیاندایە. بەڵام دەبێت بزانرێت کە ژیان پێنج پلەی هەیە، ئەو لە پلەی دووهەمیاندایە. هەر لەبەر ئەوەشە کە هەندێ کەس لە زانایان گومانیان لە ژیانیدا هەیە.

چینی یەکەمی ژیان: ئەم ژیانەی ئێمەیە، کە پابەندی چەندین هەلومەرجی تایبەتیە.

چینی دووەمی ژیان: پلەی ژیانی حەزرەتی خضر و ئیلیاس – درودیان لەسەر بێت – کە بەتەواوی پابەندی ئەو هەلومەرجانەی ژیانی ئێمە نییە و هەندێ سەربەستی تێدایە. واتە دەتوانن لەیەك کاتدا لە چەندین جێی جیاجیادا ئامادەبن و، لە خواردن و خواردنەوەشدا – هەر کات بیانەوێت – سەربەستن.

چینی سێهەمی ژیان: پلەی ژیانی حەزرەتی ئیدریس و حەزرەتی عیسایە (سەلامی خوایان لەسەر بێت). ئەم چینەی ژیان، لەبەرئەوەی بەتەواوی خۆی لە پێداویستییەکانی ژیان دامالیوە و ڕۆشتووەتە ناو ژیانێکی مەلائیکەت ئاساوە، ئەوا ئاسکی (نوورانێتی) ی لەم ڕێیەوە بەدەستهێناوە.

چینی چوارەمی ژیان: ژیانی شەهیدانە، کە لەچاو ژیانی مردووانی گۆڕستاندا گەلێ بەرز و بڵندترە، وەك بەدەقی قورئانی پیرۆز چەسپاوە..

ئەوان بەخۆیان نازانن کە مردوون، بەڵکو لایان وایە بەرەو جیهانێکی باشتر گواستوویانەتەوە. لەبەرئەوە، تام و چێژ و بەختەوەری تەواو لەو ژیانەیان دەبەن.

چینی پێنجەمی ژیان: ژیانی (ڕۆحانی) ی و مردووانی گۆڕستانە.

کاتێك ئەمەم خوێندەوە مووچڕکەیەك بە گیانمدا هات. کچەکە پێی وتم:" من لە چینی چوارەمی ژیاندا دەژیم کە لەم کتێبەدا باسکراوە".کەواتە ئەو کچە شەهیدێك بوو.

## دەبوو ئەو کچە فریشتە ئاسایە بدۆزمەوە:

ئاە خوایە گیان! واتە ئەو کچە هەرەجوانەی کەمێك پێش ئێستا لای من بوو شەهیدێك بوو؟ کەواتە شەهیدان وا دەزانن مردوون.. بەڵام ئەوان لەناوماندا دێن و دەچن! بەئێزنی خوا یارمەتی بێچارەکان دەدەن.

ئەمە زۆر مەزن بوو.. خوایەگیان، مێشکم تێکەڵ و پێکەڵە. کاتێك هات پرسی:" تۆ داوای دەرمانت کردووە؟". منیش تەلەفونم کردبوو بۆ دەرمانخانە دەرمانم بۆ بنێرن. کەوایە پێویستە خاوەنی دەرمانخانەکە ئاگای لەم ڕووداوە هەبێت.

خێرا دەستم دایە تەلەفونەکە. لەوانەیە سەبریە خان لە دەرمانخانەکەوە ئەو کچەی ناردبێت. هیچ نەبێت پێی دەوتم ئەو کچە فریشتەیە کێ بوو.. یارمەتی دەدام ئەم ڕووداوە پڕ نهێنییە شیبکەمەوە.

هەر کە تەلەفونەکەی هەڵگرت بەپەلە وتم:

– تۆ حەپت بۆ من نارد خوشکێ؟

– نەخێر نیلۆفەر خان. تۆ داوای دەرمانت لە من کردووە؟

سەرم لێ شێوا و نەمزانی چی بڵێم. بیریشم نایەت چیم پێ وت. سەبریە خان وتی:

– تۆ حاڵت باش نیە، پێویستیت بە یارمەتی هەیە؟

هیچم نەدەبیست. تەنها بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەو کچە چۆن دەیزانی من دەرمانم دەوێت. وەڵامی خۆمم ئاوا دایەوە:" شەهیدان دەزانن. ئەوان کەسانێکی باشن کە لە ڕێی خوادا مردوون".

ئەگەر ئەوەی کچەکە وتی ڕاست بێت من بە بریندداری گەیاندمە خەستەخانە. ئایا دوای ئەوە شەهید بووە؟ ئەی خێزانی ئەم کچە لە کوێ یە؟

دەبوو زانیاری لەسەر ئەو کچە فریشتە ئاسایە پەیدابکەم کە لەناکاو هاتە ژیانمەوە و لە مردن ڕزگاری کردم. ئەوکاتە دەمتوانی بزانم کێیە و چ کارەیە. لەوانەشە خێزانەکەیم بدۆزیبایەتەوە و پرسیارم لەوانیش بکردایە.

باشە، دەبوو لە کوێوە دەست پێبکەم؟ کەوتمە بیرکردنەوە لەمە. دەبوو شوێنەواری کچێك بدۆزمەوە کە ساڵانێك لەمەوپێش بە بریندداری گەیاندوومەتە نەخۆشخانە. ئەو ڕۆژی ڕووداوی هاتوچۆیەم زۆر باش لەبیرە. ساڵڕۆژی لەدایکبوونم بوو. ساڵ و ڕۆژی ڕووداوەکە دەزانم. کەواتە پێویستە بچم بۆ نەخۆشخانە و لە تۆماری نەخۆشەکانی ئەو ڕۆژە بڕوانم. لەوانەیە سەرەداوێکم چنگ بکەوتایە.

ئەو شەوەم تا بەیانی بەزۆر ڕاکێشا. چەندەها مانگ بوو ئەوە یەکەم جار بوو شەوێك بێ ئازار و ژان بەسەربەرم، چونکە هەموو خەیاڵم لای ئەو کچەبوو. دیمەنی جوان و سەرسامکەری بۆ ساتێك لە چاوانم ون نەدەبوون. وەك بڵێی ئەگەر لێی بکۆڵمەوە ئیتر دەیدۆزمەوە و پێی شاد دەبم. ئەم باوەڕە بەرگرییەکی لەڕادەبەدەری پێدابووم.بەیانی زوو سەردانی دەرمانخانەکەم کرد. کاتێك سەبریە خان بینیمی شڵەژا. وتی:

– خێرە نیلۆفەر خان، تەلەفونت کرد و باسی دەرمانت کرد، ئنجا خەتەکە بچڕا. هیچ تێنەگەیشتم. حەتمەن تەلەفونەکەشت بە کراوەیی

جێهێشتووه، بۆیه هەرچی پەیوەندیم دەکرد داخرابوو. پێویستیت بە دەرمان بوو؟

– نەخێر.

– ماشەڵڵا ئەمڕۆ باش دیاریت نیلۆفەر خان.

– بەڵێ، ئەمڕۆ کەمێك باشترم.

کەمێك پارەم بەقەرز لێ وەرگرت. بەڕێکەوتم بەنیازی ئەوەی بچم بۆ نەخۆشخانەکە. ئەو ڕووداوەی بەسەرم هات ئەوەندە کاری لێ کردبووم بیرم لە هیچی تر نەدەکردەوە. هیچ شتێکی تر سەرنجی ڕانەدەکێشام. دەمویست چی زووە بزانم ئەو کچە کێیە، بەشکم جارێکی تر بمتوانیایە ببیبینمەوە.

# بەشی شەشەم

## یەکێك لە دۆستانی خوا



چووم بۆ نەخۆشخانەکە، بەڵام نەمدەزانی چۆن و لەکوێوە دەست پێبکەم. پێویست بوو نهێنی ڕووداوێك کە دە ساڵ لەوەوپێش ڕووی داوە هەڵبدەمەوە. کێ دەبووە یارمەتیدەرم لەم هەموو قەرەباڵغییەدا؟

چووم بۆ پرسگەکە. بەکورتی بۆم باسکرد. بەڵام کارمەندەکە نەك یارمەتی نەدام، بەڵکو هەر گوێشی لێ نەگرتم..

تێگەیشتم کە دەبێت کەسێکی بەرپرس بدۆزمەوە و لە ڕێگەی ئەوەوە کارەکە جێبەجێ بکەم. بەڵام بەداخەوە یەکێکیان مۆڵەتی وەرگرتبوو، یەکێك لەوێ نەبوو، یەکێکی تریشیان وتی کە کاری زۆری هەیە و ناتوانێت یارمەتیم بدات. وردە وردە خەریك بوو ئومێدم نەدەما.

لەم سەروبەندەدا چاوم بە خانمێك کەوت لە ڕاڕەوەکەوە بەهێواشی بەرەو ڕووی من دەهات. هەر لەگەڵ یەکەم بینینیدا چووە دڵمەوە. ڕوخساری نوورانی و شیرین بوو. هەستم بە نزیکی و متمانە کرد بەرامبەری. بیرم کردەوە کە لەوانەیە یارمەتیم بدات.

کە بەلامدا تێپەڕی و هەستی کرد سەیری دەکەم، وەستا. نیگا شیرینەکانی هاتنە سەر چاوم و زەردەخەنەیەك کەوتە سەر لێوی. ئەوەندە کاریگەربوو یەکسەر ناخمی گەرم کردەوە و ئارامی تێڕژاندم. وەك ئەوە

وابوو دوای ساڵانێك جودایی بە کەسێکی خۆشەویستم شادبیمەوە. وەستا، پێش ئەوەی من هیچ بڵێم وتی:

– مەرحەبا. لەوانەیە غەریبە بیت و بتەوێت داوای یارمەتیم لێ بکەیت.

دەتوت دڵم دەخوێنێتەوە. لێی نزیك بوومەوە. دەستم درێژکرد و خۆم ناساند. لەپڕێکدا گلێنەی چاوی بچووك بۆوە، وەك ئەوەی بۆ جێیەکی دوور بڕوانێت. پاشان وتی:

– تۆ ئەو نیلۆفەر خانە بەناوبانگە نەبیت؟ ئەو کچەی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا وێنەکەی دەبینین..

– بەداخەوە من ئەوم کە ئاوا بێچارە و بێ کەس کەوتووم.

دەستمی گرت. لە ناخی دڵیەوە وتی:

– نافەرموویت؟ ژوورەکەم لێرەدایە. قاوەیەك دەخەمە خزمەتتان.

چووینە ژوورەکەیەوە. دکتۆری منداڵان بوو. شووی کردووە و دایکی دوو منداڵە.

بە چەپەڵییەکانی ژیان پیس نەبووبوو. کاتێك لە ڕوخساری پاکی ئەو خانمەم دەڕوانی دەچوومەوە قاوغەکەی خۆم و بێزم لە خۆم دەکردەوە. لە خەیاڵمدا بەراوردی نێوان شاجوانێکم دەکرد کە ئێستا نەخۆشە و لە گۆشەیەکدا تووڕدراوە، لەگەڵ ئەو خانمە دکتۆرەدا. خۆزگە ژنێکی ناشیرین بوومایە و خاوەنی خێزان و منداڵی خۆم بوومایەوە و بەحەیای خۆمەوە بژیبامایە، نەك ئەوەی جوانی سەرزاران بم و کە لەکارکەوتم تەنیا جێم بهێڵن. منێك کە هەمیشە سەرم کز و دڵم شکاو و تەنیا و بێچارەم، سوودم بۆ کێ دەبێت؟

بە پرسیارێکی ئۆزلەم خان هاتمەوە هۆشی خۆم. پێم وت کە بۆ چی هاتووم. باسی ئەو ڕووداوەم بۆ کرد کە شۆکی کردووم و سەرلەبەری ژیانمی گۆڕیوە.

## لافاوی هەستێکی ڕاستەقینە:

من دەمگێڕایەوە و هۆن هۆن فرمێسك لە چاوی ئۆزلەم خان دەهاتە دەر و بەسەر ڕووی ڕووناکیدا دەهاتە خوارەوە. زوو زوو لەبەر خۆیەوە دەیووت:" خوایەگیان، تۆ چەند گەورەیت! ". وتی:

– کەواتە (مەکتوبات) ی پێدایت ها؟!

باوەشی پێدا کردم. ڕوخساری تەڕ بووبوو. سەرمان نایە سەر شانی یەك و تێر تێر گریاین. نەمدەزانی بۆچی هەر کە ناوی (مەکتوبات) ی بیست ئەوەندەی بەلاوە سەیربوو. وتی:

– پیرۆزباییت لێ دەکەم خوشکم. تۆ خەزێنەیەکت دیوەتەوە. تۆ دوای هەموو ئەو تاوانانە هێندە بەکوڵ داوای ڕزگاربوون و ڕازیبوونی خوات کردووە، خوای گەورە ئەو هەموو ڕووداوە پڕ نهێنی و داناییانەی خەڵات کردوویت.

بەڕاستی پیرۆزباییت لێ دەکەم. ئیشەڵڵا ئەم ڕووداوە دەبێت بە کۆتایی ژیانی خراپەت و سەرەتای ژیانی پڕخێر و بەختەوەریت. دەبیت بە مرۆڤێکی نموونەیی، لەوانەی پەشیمان دەبنەوە و ڕێی ڕاست دەگرن. هەزاران جار پیرۆزباییت لێ دەکەم. تۆ بەم دڵسۆزی یەتەوە بەر ڕەحمەت و بەزەیی و میهرەبانی خوا کەوتوویت.

بە دەستەکانی چاوی سڕیم. کاتێك باوەشی پێدا دەکردم هەستێکم بۆ دروست دەبوو کە لە دوای مەرگی دایکمەوە لێم ون بووبوو. یەکەمجارم بوو نەناسیاوێك وەکو دۆستێك و خوشکێکی گەورە یان وەکو دایکم خۆشەویستیم بۆ دەربخات و لەدڵەوە لەگەڵم هەڵسوکەوت بکات.

لەو کاتەدا دەرگا کرایەوە و پیاوێکی جوانخاس و ڕێکپۆش لەگەڵ منداڵێکدا هاتنە ژوورەوە. دەستی یەکیان گرتبوو. پیاوەکە وتی:

– داوای لێبووردن دەکەم، ئەمدەزانی میوانت هەیە. ئێمە دواتر دێینەوە.

دەرگاکەی داخست.

خانم دکتۆر وتی:

– مێردەکەمە. ناوی مەتینە. کاردیۆلۆجیستە، واتە پسپۆڕ لە بواری دڵ و دەماردا. ئەو منداڵەی لەگەڵی بوو کچمە و ناوی ئەلیفە.

ئاه خوایەگیان! زۆرم ئیرەیی بە خاتوو ئۆزلەم برد. چ شتێك جوانتربوو لە خێزانێکی بچکۆلانە؟ لە ڕۆڵەیەك کە پێت بڵێت "دایە"؟ من لەوە زیاتر چی ترم دەویست خوایە گیان؟

بەدەستی خۆم ئەو جوانییەی کە خەڵاتی خوایی بوو لە خۆمم کرد بە بەڵا. ئەمێستا ئەو جوانییە منی کردبووە ناشیرینترین مرۆڤ.

## ئەو ڕاستیانەی سەرسامیان کردم:

لەگەڵ خانم دکتۆردا کەوتینە لێکۆڵینەوە. بەنیازبووین چارەنووسی کچێك بزانین کە ساڵانێك لەوەوپێش بە بریندارى هێنابووم بۆ ئەو نەخۆشخانەیە. بەم شێوەیە دەمانتوانی تاڕادەیەك ڕاز و نهێنی ڕووداوەکە شیبکەینەوە.

خوا لە ئۆزلەم خان ڕازی بێت. دوو ڕۆژی ڕێك هەوڵی لەگەڵ دام. ئاسان نەبوو جیاکردنەوە و ساغکردنەوەی تۆمارە پەرش و بڵاوەکانی ئەرشیف. لەکۆتاییدا ئەوەمان دۆزییەوە کە بەدوایدا دەگەڕاین، بەڵام بە تەواوی سەرسامی کردین.

ئەو شۆکە دنیای منی سەرەوژێر کرد. گشت نائومێدی و شکاوی دڵمی هەڵکۆڵی و فڕێی دا. هەرگیز ئەو ساتەم لەبیرناچێت...

تومەز ئەو کچە بریندارە دوای دوو ڕۆژ لە خەستەخانەدا کۆچی دوایی کردووە. واتە ئەو کچەی وەك خۆر هاتە بەردەرگام و ژیانمی ڕووناك

کردەوە مردبوو. بەداخەوە نەمانتوانی ناونیشانی خێزانەکەی لەناو تۆمارە جەنجاڵەکاندا بدۆزینەوە.

ئەی خوای میهرەبان ئەمە چ ڕووداوێکی پڕ نهێنییە؟ ئەمە چ کارێکی ناسك و پڕ حیکمەتە؟

کەواتە شەهید بوویت و نەمردوویت و لەناوماندا دەژیت. کەواتە تۆ ئەو چاکە گچکەیەی منت لەیاد نەکرد و لە پێویستترین کاتدا و لەو ساتەدا کە دەمویست خۆم بکوژم، هاتی بە هانامەوە.

" ئەی کچە شەهیدەکە! منیش کچی شەهیدێکم. توخوا بەتەنیا جێم مەهێڵە. تکایە دەستم بگرە. تکایە ڕزگارم بکە، ئەمڕۆش زۆر پێویستیم بە یارمەتی تۆیە".

## لانەیەکی پڕ ئاسودە:

ئۆزلەم خان بردمیەوە بۆ ماڵی خۆی. دەتووت هێلانەی ئارامی و بەختەوەرییە نەك خانوویەکی سادە. کەشوهەواکەی مرۆڤی تێردەکرد و دڵنیایی دەبەخشی. دەتوت ژن و پیاو و منداڵەکان بوونەتە یەك دڵ. لە کردار و گوفتاریان لەگەڵ یەکتریدا خۆشەویستی و ڕێز دەتکا.

من ژیانێکی پڕ لە عەنتەنە و تەنتەنە ژیام. چەپڵەی زۆرم بۆ لێ درا و فرە ستایش کرام. پارەی زۆر نرایە بەردەستم. چەندەها دۆست و هاوڕێ بەدەورمەوە بوون و چاوەڕێی فەرمانم بوون. لە جوانترین خانوو و ڕازاوەترین ئوتێلەکاندا ژیام. بەڵام لەو ژینە بریق و باقەدا لە هیچ جێیەك چاوم بە وەها پێکەوەژیان و دڵنیاییەك نەکەوتبوو. لە هیچ شوێنێکی تر هەوای وا پاکم هەڵنەمژیبوو.

کەواتە دەرکەوت نهێنی بەختەوەری لە چەپڵە و شۆرەت و پارە و ڕابواردندا نییە. بەختیاری ڕاستەقینە لە ڕێز و نرخاندن و خۆشەویستیدایە لەبەر خوا.

زۆر باش لەمە تێگەیشتم، بەڵام تازە درەنگ بوو. چونکە ڕێگەیەکم گرتبوو کە هاتنەوەی نەبوو.. واتە بەهارم دۆڕاند و خەزان و زستان هاتنە بەردەرگام. ژیانی لاویم لە ڕاکردن بەدوای ناوبانگدا بەهەدەر چوو.

مێردە تێگەیشتووەکەی خانم دکتۆر منداڵەکانی برد و ئێمەی بەتەنیا جێهێشت. دوو ئافرەت پێکەوە ماینەوە. ئۆزلەم خان دڵنەوایی دەدامەوە و لە هەندێك کتێب چەند بڕگەیەکی بۆ دەخوێندمەوە و هەوڵی دەدا ئومێد و بەرگریم زیادبکات.

## ڕووداوێکی دەگمەن:

ئۆزلەم خان باسی ڕووداوێکی ژیانی خۆی بۆ کردم.

ئای خوایەگیان! چ چیرۆکێکی پڕ پەند و عیبرەت بوو!

– دایك و باوکم کەسانی دیندار نەبوون. تەنانەت هیچ خۆشییان لە دینداران نەدەهات. منیش لە خێزانێکی دوور لە دیندا گەورەبووم. هیچم لە دین و ئیمان نەدەزانی.

یەك ئامانجم هەبوو لە ژیانمدا: بەدڵی خۆم بژیم و بەختەوەربم. زۆر دەوڵەمەندبووین. بە کەیفی خۆم پارەم تەخشان و پەخشان دەکرد. چیم بەدڵ بووایە دەمپۆشی و حەزم لەکوێ بووایە دەچووم. هیچ بەربەست و یاساغێك لەبەردەممدا نەبوو. یەکێك پێی بوتمایە فلان کارت پێچەوانەی بەهاکانی کۆمەڵگەیە. پێم دەوت کەس پەیوەندی بە ژیانی منەوە نیە و من ژیانی خۆم دەژیم!

لە ژیانی کەیف و سەفا و ڕابواردندابووم کە مەتینی مێردمم ناسی. ئەویش وەکو من شوێن چێژ و خۆشی کەوتبوو و بەدڵی خۆی پارەی خەرج دەکرد. هەردووکمان لە کۆلێجی پزیشکی وەرگیراین و بووین بە دەستگیرانداری یەك.

وتمان:" دەگەڕێین و وڵاتێك نامێنێت گەشتی بۆ نەکەین. هەموو شوێنە مێـژوویی و گەشـتیارییەکانی دنیـا دەبیـنین و لـە چ جێیـەك ڕابـواردن و سەرگەرمییەك هەبێت ئێمە لەوێ دەبـین. گشـت شـارە جوانـەکانی جیهـان تاقیدەکەینەوە.."

دنیا بۆ ئێمە شاری خەونەکان بوو، جێی کەیف و سـەفابوو. مەیـدانێك بوو تێیدا بتوانین بە کامی دڵی خۆمان بژین.

جارێکیان لـە شـارێکی گەشـتیاری لەگـەڵ چـەند ناسـیاو و برادەرێکـدا ڕامانـدەبوارد و خۆشمـان دەگوزەرانـد. سـەرخۆش بووبـووین بـە ژیـانی دەوڵەمەنـدی و هەڵەخـەرجی و زیـادەڕەوی. هـیچ شـتێك بـە خەیاڵمانـدا نەدەهات. ئەوەی تەنها گرنگ بوو بەلامانەوە تامکردنی ژیان بوو.

لەکاتێکدا ئێمە وامـان دەزانـی زۆر بـەختیارین، ئـەو ڕووداوە سـامناکە ڕوویدا. زللەیەکی بەسـوێی خـوایی بـوو ئێمـەی هێنایـەوە هـۆش خۆمـان و ژیانمانی گۆڕی.

من و دەستگیرانەکەم بەڕێدا دەڕۆیشتین کاتێك سلێنگێك خـۆی پێمانـدا کێشا. ڕووداوێکی زۆر ترسناك و مەترسیداربوو.

کاتێـك لـە نەشـتەرگەری هێنامیانـە دەر کـەمێك هۆشـم بەخۆم بـوو. جاروبار گوێم لە دەنگی دەوروبەرم دەبوو. هەندێك کاتیش بەتەواوی هۆشم نەدەما. هەستم دەکرد لە بارودۆخێکی زۆر مەترسیداردام.

چەندەها مانگ نەشـتەرگەری و تـەداوی و ئەشـکەنجە درێـژەی کێشـا. بـاوکم پـارەی دنیـای نـابووە بەردەسـتی دکتۆرەکـان، بـەڵام وتبوویـان:" بەداخەوە حاڵی کچەکەتان زۆر مەترسیدارە. ئەم کاتانـە زۆر گرنگـە بـۆی. ئێمە هیچ شتێکمان لە دەست نایەت. هەموو ساتێك دەکرێت هەموو شـتێك ڕووبدات."

ئەم وتەیەی دکتۆرەکان وەك بۆمبێك لە مێشکمدا تەقییەوە. خۆ من هێشتا لە سەرەتای ژیاندام. من گەنج بووم، چۆن دەبێت بمرم؟ بەهیچ جۆرێك باوەڕم نەدەکرد.

من ناکرێت بمرم. من ناکرێت بچمە ئەو شوێنە تاریکەوە، ئەو گۆڕەوە.لەوانەی دەورووپشتم دەپاڕامەوە:" زۆر لە تەنیایی و مردن دەترسم. تکاتان لێ دەکەم چارەیەك بدۆزنەوە. دەستم بەرمەدەن، مەمدەنە دەست مەرگ تکاتان لێدەکەم."

## گەڕانەوە بۆ ژیانی ڕاستەقینە:

لەو کاتانەدا کە لاواز و کۆڵەوار و بێ چارەبووم بیرێك هات بە خەیاڵمدا. وتم لەوانەیە خوا دەرگای ئومێدم لێ بکاتەوە.

بە شەرمەزارییەوە کەوتمە پاڕانەوە لێی:" یارمەتیم بدە خوایە گیان! پەیمان بێت دەبمە بەندەیەك تۆ پێت خۆش بێت و هەرگیز لە ڕێگات لانەدەم. پەیمان بێت ئەگەر لەم جێگایە بێمە دەر ژیانم بگۆڕێت. هەوڵ دەدەم بەندەیەك بم شایانی تۆ."

منیش خۆم بۆ نەگیرا و دامە پرمەی گریان و خۆم هەڵدایە باوەشی ئۆزلەم خانەوە. وتم:

– منیش دەمەوێت ڕزگارم ببێت. توخوا یارمەتیم بدە، منیش دەمەوێت ڕزگارم ببێت. دیسان کەوتینەوە فرمێسك ڕشتن. دەتووت ئەوە ژیانی منە کە دەیگێڕێتەوە. خانم دکتۆر بەردەوام بوو لەسەر گێڕانەوەکەی:

– بە ئەندازەی ژمارەی بوونەوەران سوپاس بۆ خوا، کە هەر ئەوە ژیان دەداتە مردووان، داماوان ڕزگاردەکات و کەسی بێکەسانە.. ژیانێك و هەلێکی نوێی پێدام. لە نەخۆشخانە دەرچووم و بەپێی خۆم هاتمەوە ماڵەوە. تەنها بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن ببمە بەندەیەکی باش.

سەرەتا دەستگیرانەکەم مارەی کردم. چونکە لەوەوپێش بێ مارەیی پێکەوە دەژیاین. پاشان دەبوو داواکانی پەروەردگارم جێبەجێ بکەم، بەڵام چۆن؟ لە کوێوە دەست پێبکەم؟ هیچم نەدەزانی.

لە شوقەکەماندا پیاوێکی مامۆستا هەبوو. لەگەڵ ژنەکەیدا هاتبوون بۆ سەردانمان لە وەختی نەخۆشییەکەمدا. پاك و دینداربوون. پرسیاری دەستنوێژ و نوێژم لێ کردن. خوا لێیان ڕازی بێت یارمەتیدەرمان بوون.

چۆن دەتوانم ئەو یەکەم نوێژەت بۆ بگێڕمەوە؟

کاتێك چوومە سەر بەرماڵەکەم دڵم کەوتە لێدانێکی توند و وەختبوو هەپرون هەپرون ببێت. ئەوەندە شەرم دایگرتم لە حزووری پەروەردگارمدا هەموو گیانم نیشتە سەر ئاو. هەرگیز ئەو ساتەم لەبیرناچێت کە نێوچاوانم نایە سەر بەرماڵەکە. دەمویست بگریم و بپاڕێمەوە و داوای لێبووردن بکەم. باوەڕ بکە فرمێسکەکانم بەرماڵەکەیان تەڕ تەڕ کردبوو.خوا لەو مامۆستایە و ژنەکەی خۆش بێت. بەدرێژایی شەش مانگ تا من بەتەواوەتی هەستامەوە سەرپێ بە بەردەوامی سەردانیان کردین. لە بابەتە ئیمانییەکاندا یارمەتییان داین و بۆیان ڕوون کردینەوە. ڕۆژانە وانەیان بۆ دانابووین.

من و مێردەکەم و دایکم زۆر سوودمان لەو ئامۆژگاری و وانانە وەرگرت.

هەزاران سوپاس بۆ خوای پەروەردگار. من و مێردەکەم و دایکم دەستمان کرد بە نوێژکردن و بەردەوام بووین لەسەر فێربوونی ئەرك و بەندایەتییەکان. تێگەیشتین کە بەختەوەری و چێژ و ئارامی ڕاستەقینە تەنها لە ئیماندایە، بەڵام بەداخەوە باوکم هیچ سوودێکی وەرنەگرت. سووربوو لەسەر کەللەڕەقی و گوێی نووقاند لە ئاستی ئەو حەقیقەتانەدا. نە وازی لە خواردنەوە هێنا و نە لە خووە خراپەکانی تریشی.."

ژیانی ئۆزلەم خان و چیرۆکەکەی زۆر کاریگەربوو لەسەرم. چونکە ئەویش وەکو من سەردەمێك لە گێژاودا ژیاوە. بەڵام لە کۆتاییدا سەرکەوتووبووە و، خۆی لەو تاوانانە ڕزگارکردووە و بووەتە موسڵمانێکی نموونە و هۆشیار. منیش تەنها ئەم پرسیارەم لە خەیاڵدا بوو:" ئایا منیش دەمتوانی سەرکەوتووبم؟ ئایا دەکرێت دووبارە ژیان بچێتەوە بە بەر تەرمی ساردەوەبووی تەمەنمدا و جوانییەکانی ئیمان بەدەست بهێنم؟ "

## لەدنیادا چی ڕووی دەدا:

ئۆزلەم خان بەردەوام بوو لەسەر گێڕانەوەکەی:

– باوکم یەکێك بوو لە دەوڵەمەندترینەکانی شار. بازرگانیی ئاڵتونی دەکرد. ماڵ و موڵکی بەلاوە گرنگتربوو وەك لە بەندایەتی. بەداخەوە کۆتاییەکی زۆر ترسناکی هەبوو.

سەری داخست و دەستی بە دەمیەوە گرت. لێم پرسی:

– سەرەنجام چی بوو؟

– سوپاس بۆ خوا ئێمە چەند لە تواناماندا بێت هەوڵمان داوە بە دین و ئیمانی خۆمانەوە بژین. دەکۆشین ئەم ڕاستییانە بە کەسانی موحتاجی تریش بگەیەنین. بەڵام خەفەتی باوکمم قەت لەبیرناچێت. باوکم کۆچی دوایی کرد، بەڵام بە مردنێك کە لەزری بە جەستەدا دەهێنا و دڵی دەکرد بە ئاو.

باوکم یەك ئامانجی هەبوو: ببێت بە دەوڵەمەندترین. هەرچەندە یەکێك بوو لە بازرگانە هەرە زەنگینەکانی شار کەچی تێری نەدەخوارد. ڕۆژبەڕۆژ ژمارەی دوکان و ئاڵتونەکانی زیادیان دەکرد و ئەویش تەماحی پتردەبوو. تا دەستی بکەوتایە ئەوەندەی تر برسیتر دەبوو. هیچ شتێك بەقەدەر پارە و ئاڵتون لای ئەو نرخی نەبوو. دین و ئیمان و بەها مەعنەوییەکان و ڕاستگۆیی و ئەخلاق شتانێك بوون کە لە دونیای ئەودا بوونیان نەبوو.

پێشتر هەستم بەوە نەکردبوو کە باوکم چەند دوورە لە بەها مرۆییەکان و تەنها بۆ پارەکانی دەژی. چونکە ئێمەش لە هەمان بیروبۆچووندا دەژیاین. دوای ئەوەی گەڕاینەوە هەستمان پێکرد. دایکی ڕەحمەتیم زۆر لە باوکم دەپاڕایەوە: " بەسە ئیتر پیاوەکە. سوپاس بۆ خوا هەموو شتێکمان هەیە. ترنجاویت لەژێر ئەو هەموو پارە و ئاڵتونەدا. ڕۆژێك ئەم تەماحەت سەرت گوم دەکات. کەمێك لە خۆت بڕوانە. گوێ لە وتەی خواگیان بگرە. بیر لە ئەرکی بەندایەتی بکەوە. زۆر دڵتەنگ دەبم کە وا دەتبینم. خوا نەخواستە وا بڕوات ژیانی هەمیشەییت وێران دەکەیت.."

باوکم هیچ کات گوێی بەم قسانە نەدەدا و هەموو کەرەتێکیش دڵی دایکمی دەشکاند و دەیووت:

– دیسانەوە شتی پڕوپووچ دەڵێیت ژنەکە..

من و مێردەکەشم جاروبار بە زمانی شیرین ئەم بابەتەمان بیری باوکم دەخستەوە و دەمانویست قەناعەتی پێبکەین ڕووبکاتە خوا و نوێژەکانی بکات. بەڵام سوودێکی نەبوو.. هیچ نەگۆڕا.

زۆر بێتاقەت دەبووم بەو حاڵەی باوکم. دەزانیت، کچان باوکیان زۆر خۆشدەوێت. باوەڕبکە چەندەها شەو لەسەر بەرماڵ دوعام بۆ کردووە و بۆی پاڕاومەتەوە و فرمێسکم ڕشتووە. دەمووت:" یا ڕەببی! باوکم زۆر خۆشدەوێت. حەزدەکەم ئەویش هەست بە جوانی ئیمان بکات. تکایە ئەویش هیدایەت بدە. ئەگەر ئاوا بمرێت بەختەوەری هەمیشەیی لە دەست دەدات. من بەرگەی ئەمە ناگرم، تکایە یارمەتی بدە ".

## باوکم هەر لە خوا نزیك نەدەکەوتەوە:

بەڵام ئەو هەر وەکو خۆی وابوو. چونکە گەوهەری ناخی باوکم بەجارێك ڕەش بووبوو. ئەو هەست و تێگەیشتنەی ون کردبوو. نەیدەتوانی لەو تەماحی سەروەت و سامانە خۆی بتەکێنێت و بگاتە هەرێمی مەعنەویەت.

ئا بەم شێوازە باوکم هەنگاو بە هەنگاو لەو مردنە ترسناکەی نزیك دەبووەوە. من و مێردەکەم و دایکم ئەمەمان بە باشی دەبینی کەچی خۆی کوێربووبوو لە ئاستیدا. وای دەزانی سەڵتەنەتێکی ئەبەدی دادەمەزرێنێت و بەردەوام بوو لەسەر گوناهەکانی.

لە کۆتاییدا ئەو ڕۆژە ڕەشانە هاتنە پێش کە لێیان دەترساین. باوکم لەناکاو تووشی جەڵدە بوو. هەموو هەوڵێکمان دا، وەلێ بێ سوود بوو. باوکم لە بەرچاومدا هەنگاو بە هەنگاو دەچووە دەمی مەرگەوە. بەتایبەتی دوا ساتەکانی، هەرکاتێك بیرم دەکەوێتەوە گشت گیانم لەرز دایدەگرێت. خوا ئەو دیمەنانە پیشانی کەس نەدات.

باوکم بە زۆر چەند وشەیەکی لە زار دەهاتە دەر و هەندێك کاتیش بە ئاماژە تێی دەگەیاندین چی دەوێت. من و مێردەکەم لە لایەکەوە و دایکم لە لایەکەوە هەوڵمان دەدا بەشکم شایەتومان بێنێت و داوای لێخۆشبوون بکات، کەچی بۆ یەك جاریش ناوی "خوا" بە زمانیدا نەهات. بە دیتنی ئەو دیمەنە دڵم دەبوو بە ئاو. خەریك بوو پەردەی چاوی دادەهاتەوە و کۆتا هەناسەی دەدایەوە، بەڵام هێشتا وشەیەکی پیرۆز و دوعایەك لە زاری نەهاتبووە دەر. دەتوت دەمی قفڵی لێ دراوە. بچووکترین نیشانەی پەشیمانی و تەوبەی پێوە دیارنەبوو.

## هەموو ئاڵتوونەکانم بهێنن بۆ ئێرە:

لەکاتێکدا ئێمە دنیامان لێ هاتبووەوە یەك و فرمێسکمان دەڕشت، بۆ ساتێك باوکم هاتەوە هۆشی خۆی و شتێکی وت کە هەموومانی سەرسام کرد: " بڕۆن لە دوکانەکانمدا چی ئاڵتون هەیە بیکەنە سندوقێکەوە و لامەوە داینێن."

من و مێردەکەم و دایکم لە هەمبەر ئەو داوایەوە سەرسام بووین و نەمانزانی چی بکەین. دایکم قیژاندی بەسەریدا: " چۆن داوای شتی وا دەکەیت پیاوەکە؟ تۆ لەسەر پێخەفی مەرگیت، هێشتا تێناگەیت؟ ئەوەی تۆ ئێستا پێویستتە تۆبە و پەشیمانییە. هیچ نەبێت لە سەرەمەرگدا بیر لەمانە بکەرەوە. ئیتر ئەم ڕۆیشتنەت هاتنەوەی لەدوا نییە. بە دەستی خۆت ژیانی هەمیشەیی خۆت دەڕووخێنیت. هیچ نەبێت لەبەر ئێمە و دڵمان مەشکێنە."

بەڵام باوکم گوێی لە نزا و تکای دایکم نەبوو. هەر هاواری دەکرد و دەیووت: " ئاڵتونەکانم.. ئاڵتونەکانم.. ئاڵتونەکانم بۆ بێنن.."

خوایە گیان! چەند ترسناك و بەئازار بوو! باوکم کە بەقەدەر گیانم خۆشمدەویست لە پێش چاومدا دەڕۆیشت. ژیانی دەکوژایەوە و تەمەنی تەواودەبوو. هەنگا و بە هەنگاو لە حزووری خوایی نزیك دەبووەوە. بۆ تاقیکردنەوەی هەرە گەورە و لێپرسینەوەی مەزن دەڕۆیشت. بەرەو ئەو دادگاییە دەچوو کە تەنانەت وەلی و پیاوچاکان و سەحابەکان لێی ترساون و پەنایان بە خوا گرتووە لێی. کەچی ئەو هێشتا هاواری ئاڵتونەکانی دەکات!

## هەنگاو بەهەنگاو لە كۆتايی نزيك دەبوويەوە:

لە كۆتايی دا بەرگەی ئەو هەموو هات و هاوارەی باوكمان نەگرت و ناردمان سندوقێك ئاڵتونی بۆ بێنن. بەداخەوە كۆتا داواكاری ئەوەبوو.. لە لایەكەوە من و لە لایەكەوە دایكم قورئانمان بەسەردا دەخوێندەوە، كەچی ئەو دەستی خستبووە ناو ئاڵتوونەكانی و دەیناڵاند: " ئاڵتونەكانم.. ئاڵتونەكانم.."

دەتووت پێیان دەڵێت:" تكایە وازم لێ مەهێنن. ئێوە باشترین دۆست و هاوڕێمن. من تەمەنێكم لەپێناو ئێوەدا بەسەربرد. هەنووكە دوا هەناسەم دەدەم. تكایە دەستم بگرن و مەمدەنە دەستی مردن".

باوكم لەپڕێكدا حاڵی خراپ بوو. هۆشی نەما و چاوی زەق بوو. لەگەل دایكمدا ڕامان كردە سەری. دایكم هاواری دەكرد:" بڵێ الله پیاوەكە، بڵێ الله.."

باوكم هیچ وەڵامێكی نەبوو. خیزە خیز لە قوڕگیەوە دەهات. دیاربوو ئەوە دوا هەناسەیەتی. بەو حاڵەشەوە هێشتا دەستی بەنێو ئاڵتوونەكانیدا دەگێڕا و هاواری ئاڵتونەكانی دەكرد. چاوی كرابووەوە و گلێنەكانی خەریك بوو دەهاتنە دەر.

ئاە باوكی من ئاە! هیچ گوێت لێ نەگرتین. خوات بیرنەكەوتەوە و تێنەگەیشتیت بۆ چی دەژیت.

ئۆزلەم خان بەدەم گریان و هەنسكەوە بەردەوام بوو لەسەر گێڕانەوەی چیرۆكە پڕ پەند و عیبرەتەكەی:

– خۆم بۆ نەگیرا. چووم مامۆستا مورادم بانگ كرد كە وانەی دین و ئیمانی پێمان دەوتەوە. كەسێكی زانا و پیاوچاك بوو. خێرا هات بە دەممانەوە. كە بەو حاڵەوە باوكمی بینی زۆر سەرسام بوو.

## دوا هاوارەکانی باوکم:

سورەتی یاسینی کردەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوەی. بەڵام بینیم ڕوخساری مامۆستا گۆڕا و تێگەیشتم شتێکی خراپ خەریکە ڕوودەدات. بەپەلە چوومە لایەوە و پرسیم:" چییە مامۆستا؟ "

بەدەست ئاماژەیەکی بۆ کردم بە مانای: " دوایی پێت دەڵێم ".

باوکم گیانی دەدا. دایکم دەلالایەوە و تکای لێ دەکرد ناوی خوا بڵێت و شایەتومان بێنێت. کەچی ئەو دەستێکی نابووە ناو سندوقەکەوە و دەستەکەی تری بە هەموو هێزی بەرەو پێشەوە درێژکردبوو، هاواری دەکرد: " مەهێڵن بێن. دێن بمکوژن. سزام دەدەن. مەمدەن بە ئەوان، با نەیەن! "

هەرچەند بە گریان و فیغان بەزوور سەریەوە بووین و داوامان لێ دەکرد شایەتومان بێنێت کەچی ئەو هەر هاواری دەکرد و دەیووت:" ئەوە هاتن، مەهێڵن بێن، مەمدەنە دەستیان."

نازانم چۆنی باسی ئەو ترسەی ڕوخساری و کەفی دەمی و هاتوهاواریت بۆ بکەم.

ئەوەش کۆتایی ژیانێك.. ئەوەش تەواوبوونی تەمەنێك.. وەرگرتنەوەی گیان لێمان.. لە ئەجەل و مەرگ و گۆڕ و پاشان لێپرسینەوە خۆدزینەوە و بەرتیل نییە. نە ئەجەل لەناو دەبرێت و نە دەرگای گۆڕ دادەخرێت. هەموو کەسێك بێ جیاوازی تێیدەچێت.

ئۆزلەم خان دەستە لەرزۆکەکانمی نایە دەستی خۆیەوە و وتی:

– نیلۆفەر خان، ناخۆشترین شتیش ئەوەبوو ئەو مامۆستایەی بانگمان کرد قورئان بخوێنێت، وەك بڵێی لە خوایییەوە دەمی بەسترابێت نەیتوانیوە یەك ئایەت چییە بخوێنێت. واتە ئەگەر بەندە شایان نەبێت

خوای گەورەش هیدایەتی نادات. سەرەتا پێویستە بەندە بیەوێت و ئامادەبێت.

## ئەی خەونەکانی من چی لێدەهات:

خۆمم پێڕانەگیرا و خۆم هاویشتە باوەشی ئۆزلەم خانەوە، بەدەم پرمەی گریانەوە وتم:

– ئەی من، ئەی من چیم بەسەر دێت؟ من چی لەم هەموو گوناهە بکەم؟ چۆن بەم پیسی و چەپەڵی و تاوانەوە بچمە حزووری خوایی؟ چی بڵێم؟ هەمان کۆتایی چاوەڕێم دەکات؟ توخوا یارمەتیم بدە ئۆزلەم خان. دەستم بەرمەدە. ڕێی ڕاستم نیشان بدە. دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ پاکیزەیی و بێتاوانی. دەمەوێت تۆبە بکەم.

– مەترسە نیلۆفەر گیان. هەرگیز وازت لێ ناهێنم. دڵتەنگ مەبە لەگەڵتدام. گەر تۆ لە دڵەوە و بەکوڵ داوا بکەیت، بێگومان خوا دەست نانێت بە ڕووتەوە. ئەو هیدایەت دەبەخشێت بەوانەی دەیانەوێت. یەکێك لە دەرگانەی ئەو بدات بە دەستی خاڵی ناگەڕێتەوە.

ئەو شەوە ئۆزلەم خان زۆر گریا و منیشی گریاند. بەڵام شەوێك بوو کە هیوامی گەشاندەوە و هەستی شیرین و جوانی نایە دڵمەوە و ئارامی پێبەخشیم. خوای گەورە لەڕێی ئەو کچە شەهیدەوە منی گەیاند بە ئۆزلەم خان. منیش تەنها دەمویست ببم بە بەندەیەکی باش بۆ خوای پەروەردگار.

# بەشی حەوتەم

## بەدرێژایی شەو لە خودا پاڕامەوە



ئەو شەوە میوانی ئۆزلەم خان بووم. بیرم نایەت لە ژیانمدا هیچ شەوێك بەقەدەر ئەو شەوە ئارام و ئاسوودەبوویم. شەوێك پڕ لە بەختەوەری و لێوان لێو لە شادی.. چەندەها مانگ دەبوو وا خۆش خەوم لێنەکەوتبوو.

بەدرێژایی ئەو شەوە تا بەیانی پاڕامەوە تا خوای گەورە لەم ژیانە جوانەم دانەبڕێت، بەڵام هێشتا لە سەرەتای ڕێدابووم. ڕێیەکی درێژ و ماندووکەرم لە پێشدابوو. ئەمە لە کاتێکدا تا دەهات ئازارم زیادی دەکرد. کاتێك بۆ ئۆزلەم خانم باسکرد خێرا لە نەخۆشخانە خەواندمی. وەکو خوشکێکی گەورە ئاگاداریی لیٚ دەکردم.

هەموو ڕۆژێك دەهات و تاقیبی چارەسەرییەکەمی دەکرد. دڵی دەدامەوە و (پەیامی بیماران)[1] ی بۆ دەخوێندمەوە. جگە لەوەش پارەی چارەسەری و نەخۆشخانەی دابوو.

---

١- پەیامی بیماران پەیامێکە لە سەرجەمی پەیامەکانی نوور لە دانراوەکانی زانای گەورەی کورد مامۆستا سەعیدی نوورسی یە. ئەم پەیامە: مەرهەم و دڵدانەوە و عەیادەت و ڕەچەتەیەکی مەعنەوی یە بۆ بیماران و نەخۆشان. مامۆستا فارووق ڕەسووڵ یەحیا کردوویەتی بە کوردی. (وەرگێڕ)

کەواتە لەسایەی کەسانی باشی وەك ئۆزلەم خانەوەیە کە تا ئێستا دنیا بەپێوە ماوە، ئەوانەی کە ژیانیان تەرخان کردووە لە پێناو ڕەزامەندی خوای گەورەدا...

وەك هەموو ڕۆژێکی تر بەیانییەك هات بۆ لام. بە خەندەی شیرین و نیگای جوانی دڵمی خۆشکرد. دەستی هێنا بە قژمدا و وتی:

– مژدەیەکت پێدەدەم. سەیری ڕاپۆرت و تۆماری نەخۆشییەکەتم کردەوە. بەرەو باشتر دەچیت. ئیشەڵڵا بەتەواوەتی چاك دەبیتەوە.

دانیشت و پەیامی بیمارانی گرت بەدەستیەوە و بۆی خوێندمەوە. ئەو کتێبە بووبووە دەرمان و سەرچاوەی بەرگریم. ئەو ڕاستییانەی باسی دەکردن ئازارەکانمیان سووك دەکرد و سووکنایی‌یان پێدەدام.

## نەخۆشێکی جێی پەند و عیبرەت:

لە نەخۆشخانەدا شایەتحاڵی ڕووداوێکی زۆر سەیربووم. چەند ژوورێك لەولاترەوە کچێك تووشی نەخۆشییەکی ترسناك بووبوو. تەمەنی هەژدە ساڵ بوو. زۆر جوان و نیان بوو. هێشتا لە بەهاری عومریدابوو.

نەخۆشییەکەی لە جۆرێك بوو پەند و عیبرەت بوو بۆ هەموو مرۆڤێك. من شێرپەنجەی ئێسقانم هەبوو کە لێرە و لەوێ دەبینرا و ڕووی دەدا. هەرچۆنێك بوو دەمتوانی لەگەڵیدا هەڵبکەم. لەوانەشە خوای گەورە ئەو نەخۆشییەی بۆ کەفارەتی گوناهەکانم ناردبێت، بەڵام ئەوەی ئەو کچە لە جۆرێك نەبوو مرۆڤ بەرگەی بگرێت.

تووشی شێرپەنجەی دەم بووبوو. ئەو خانانەی بەپرسیاربوون لە دەردانی لیك لەکارکەوتبوون. واتە دەمی وشك دەبووەوە و شەقار شەقار دەبوو. لێوی بەیەکدا دەنووسا و هەردەم خوێنی لێ دەهات. بۆیە هیچی بۆ نەدەخورا و بۆی قووت نەدەدرا.

ئەو تف و لیکەی خەڵك بێزی لێ دەکەنەوە و فڕێی دەدەن، بۆ ئەو نیعمەتێکی مەزن بوو. لە ئازاردا دەتلایەوە.

باوکی کچەکە زۆر دەوڵەمەندبوو. هەرگیز هاتوهاواریم بیرناچێت. دەیوت:" یارمەتیمان بدە یارەببی! ناچاری دڵۆپێك لیك بووین. بە سەروەتی ملیۆنیمەوە قەترەیەکم بۆ ناکڕێت و دەستەوسانم. چارەمان تەنها لای تۆیە خوایە گیان."

خوای پەروەردگارمان تۆ چەندە نیعمەت و ئەندامی بەسوودت پێبەخشیوین! تا لەدەستیان نەدەین هەست بە نرخیان ناکەین. هەموو ئەو شتانەی خولقاندووتن بەسوودن، هەتا ئەگەر تفێکیش بێت.بە ئەندازەی ژمارەی بەخششە خواییەکان سوپاس بۆ خوای میهرەبان کە توانیم وردە وردە بەسەر نەخۆشییەکەدا زاڵ ببم و بێمەوە سەر خۆم. لە ڕووی دەروونیشەوە زۆر زۆر باشتربووم.

یارمەتی و میهرەبانی ئۆزلەم خان ژیانێکی نوێی پێدام. وەکو منداڵێکی خۆی سەرپەرشتی دەکردم. سێ مانگ زیاتربوو ئۆزلەم خانم ناسیبوو. واتە سێ مانگ لە سایەی شەفەقەتی ئۆزلەم خاندابووم. بەڵام مادەم ئێستا هاتوومەتەوە سەر خۆم و باشتربووم، پێویستە بگەڕێمەوە بۆ ماڵی خۆم. وەلێ چۆن بگەڕامایەتەوە بۆ ئەو ژێرزەمینە تاریك و بێ هەوا و شێدارە؟ دەتووت زیندانە بۆ من. دەمتوانی بچمەوە ئەوێ و پارێزگاری لەم جوانی و ئومێدە بکەم؟ یان دیسان دەگەڕامەوە بۆ ژیانە پیس و ناخۆشەکەی جاران؟ ئەوانە شوێنگەلێك بوون جوانییان لێ سەندم و دڵ و ڕۆحمیان لەکەدار کرد. یادگارییەکانی ئەوێ کۆن و بەسەرچووبوون و هەرگیز نەمدەویست بێنەوە یادم.

دەبوو ئێستا من چیم بکردایە؟ نەمدەتوانی تا سەر ببمە بار بەسەر ئەم ماڵەوە. ڕاستە نەخۆش و بێ پارەبووم، بەڵام حەقی ئەوەم نەبوو ببمە ئەرك بەسەریانەوە.

لە کۆلانێکی دەرنەچووداووم. نیازم وابوو ئەم بابەتە لای ئۆزلەم خان بکەمەوە و مۆڵەتی ڕۆیشتنی لێ بخوازم. بێگومان ئەو ئەوەندە بەڕێزبوو هەرگیز نەیدەوت:" ئیتر هیچ نەماوە لە دەستی من بێت ". دەبوو من سەرەتا بیدرکێنم و داوای ڕۆیشتن بکەم.

ئەو شەوە مێشکی ماندووم بوو بە مەیدانی شەڕێکی بێ ئامان. لە کێشمەکێش و ڕاڕایی دا بووم. دڵم نەدەهات لەوە زیاتر ژیان لەو ماڵە تێکبدەم. کاتی خواحافیزی هاتبوو لە ماڵێك کە حەقیقەتەکانی ئیمانیان پێناساندم و بەدڵ و گیان بوونە کەسوکارم و دەرگای دڵ و ماڵی خۆیان بۆ من خستە سەرپشت. بەو جۆرە خۆم بۆ بەیانی ئامادە کرد. ئەو ڕۆژە لە خەستەخانە دەردەکرام و ئیتر سێ ڕۆژ جارێك تەداویم بۆ دەکرا. بەڵام دیسانیش خەفەتم دەخوارد بە جیابوونەوە لەم فریشتەئاسایانە و ترسم هەبوو لە گەڕانەوەم بۆ نێو دنیای کۆنم.

## خوای گەورە کەس لە تەنگانەدا جێ ناهێڵێت:

هەموو بەیانییەك بەوپەڕی تامەزرۆیی و شەوقەوە چاوەڕێی هاتنی ئۆزلەم خانم دەکرد، کەچی ئەو بەیانییە بێتاقەت و دڵگران بووم. وەك پیشەی هەموو جارێکی بە زەردەخەنەوە خۆی کرد بە ژوورەکەدا و نیگا جوانەکانی تێبڕیم. دەتووت فریشتەی ڕزگارکەرە. کە چاوم چووە سەر چاوی هەستم بە ئازارێکی بەسۆ کرد بەوەی کە لەوانەیە لەمڕۆوە چیتر ئەم مرۆڤە جوانە نەبینمەوە. بە گەرمی باوەشی پێداکردم. وتی:

– خێرە؟ بۆچی دەگریت؟ شتێکی خراپ ڕووی داوە؟

نەمتوانی بڵێم:" ئیتر وەختی خواحافیزییە. ئاگری دابڕان لە ئێوە دەمسووتێنێت." پێش ئەوەی من هیچ شتێك بدرکێنم ئەو هاتە لامەوە و دانیشت و دەستی گرتم. وتی:

– دەزانم، ڕۆژانی زۆر ناخۆشت بەسەرهات. هەرکەس ئەو ڕووداوانەی بەسەرهاتبا تووشی هەمان بێتاقەتی دەبوو. بەڵام سوپاس بۆ خوا ئەوەتا تۆ باشیت. نەخۆشییەکەت بەرەو چاکبوونەوە دەچێت. ئیشەڵڵا جارێکی تر ئەو ئازارانە ناچێژیتەوە. هیوام وایە لە ئێستاش باشتر بیت و هەڵسیتەوە سەر پێی خۆت. پشت بە خوا هەست بە تام و بەختەوەری بەندایەتی بۆ پەروەردگارت بکەیت.

بیرم کردەوە ئاخر چۆن؟ لەگەڵ کێدا؟ لە کوێ؟ من بەتاقی تەنیا ئەوانەم بۆ ناکرێت. من ئەوەندە بەهێز و خۆڕاگر نیم. دەترسام. زۆر دەترسام. دەترسام بگەڕێمەوە بۆ ئەو جێیەی لێوەی هاتووم..

پەتی خەیاڵمی بچڕاند و، وتی:

– مژدەیەکیشت دەدەمێ. لەگەڵ مێردەکەشم قسەم کرد، ناکرێت بەتەنیا جێت بهێڵین. نابێت بگەڕێیتەوە بۆ ئەو ڕۆژ و یادگارییە کۆنانە. بەنیازنین جارێکی تر بتدەینەوە بەو گورگە برسییانە. لە خۆمانت جیاناکەینەوە. ئێمە تۆ بە خوشکی خۆمان دەزانین و تۆش دەبێت ئێمە بە کەسی خۆت بزانیت. لەگەڵ مێردەکەمدا نۆرینگەیەکمان هەیە. وەکو پێشتریش پێم وتویت من دکتۆری منداڵانم و ئەویش پسپۆڕی نەخۆشییەکانی دڵ و دەمارە.. لەوێ میوانمان بە. هەم وەك سکرتێرێك کارمان بۆ دەکەیت و هەم لەو ژوورەدا دەمێنیتەوە کە بۆمان تەرخان کردوویت. ئەوێ جێگەیەکی گونجاو و ئەمینە. چیت پێویست بێت ئێمە بۆتی دابین دەکەین. واتە لەو ئەندێشەیەش ڕزگارت دەبێت کە وا خەیاڵ بکەیت دەبیت بە ئەرك بەسەر ئێمەوە..

چاوە جوانەکانی نایە سەر چاوم و، وتی:

– دەڵێی چی؟ گونجاوە بۆ تۆ؟

چاوەکانم داخست. فرێسکی شادیم ڕیزیان بەست. شەپۆلێکی فێنك و نەرم بە هەموو بوونمدا تێپەڕی. بە ئەندازەی ژمارەی خانەکانی جەستەم سوپاسی خوام کرد. ئاە تۆ زۆر زۆر گەورەیت خوایەگیان! تۆ زۆر مەزنیت! دەچیت بە هانای بەندە زەبوونەکانتەوە. تۆ یارمەتیدەری نەخۆشان و بێکەسان و هەژارانیت. مەگەر دەکرا بەو پێشنیارە جوانە بڵێم "نەخێر" ؟ دەستەکانم لە ملی فریشتەکەم ئاڵاند. دەمویست بینێم بە دڵمەوە و ئامادەبووم لەبەر خاتری ئەو هەزاران جار بمرم. ئەم مرۆڤانە نوێنەری ڕاستەقینەی ئاشتی و مەردی یارمەتیخواز و فریشتەی چاکەکاربوون.هەنووکە لاپەڕەیەکی نوێ بۆ من کرابووەوە. ژیانێك پڕ لە جوانی و پەند. لەمەودوا دەبمە تاکێکی ئەو خێزانە نوورانیەیە. ئۆزلەم خان و مێردەکەی بە "خوشك" بانگیان دەکردم و منداڵەکان پێیان دەوتم "پورێ".

دنیایەکی نوێم هەبوو. تەژی بوو لە هیوا، بە دۆستی وەفادار ڕازابووەوە، دووربوو لە مرۆڤگەلی ڕیاکار. لێرە مرۆڤەکان لەبەر خوا یەکتریان خۆشدەویست. ئۆزلەم خان هەموو شتێکی منی دابین دەکرد. هەمیشە دەستی پێمەوەبوو. بەتایبەتی هەوڵی دەدا باوەڕ و ئیمانم پتربێت و بمناسێنێت بە حزووری مەستکەر و کێشکەری خوایی. سەرەڕای ئەوەی ڕۆژانە زۆر ماندوو دەبوو، کەچی شەوان وانە و دەرسی ڕێکدەخست. لەگەل مێردەکەیدا لە چەند کۆمەڵەیەکی خێرخوازیدا خۆبەخشانە کاریان دەکرد. قوتابخانە و بەشە ناوخۆییەکان بەشێك بوون لەوانە..

بـێ بەرامبـەر چارەسـەری نەخۆشـە هـەژارەکانیان دەکـرد و مانگانـە مووچەیان بڕیبـووەوە بـۆ خوێنـدکارە کەمدەسـتەکان. کاتێـك ئەمەشـم لـە ئۆزلەم خان و مێردەکەی بینی ئەوەندەی تر چوونە دڵمەوە.

لـە سـەردەمێکدا کـە خـەڵکی شـوێن پـارە کـەوتوون و لـە خـەمی سـەروەتدان و ڕادەبـوێرن، ئـەم دووانـە هـەموو کاتـەکانیان بـۆ خێـر و پەروەردەکردنی لاوان تەرخان کردبوو. لە خڕبوونەوە و کۆبوونەوەکانیشدا بەدەم چا خواردنەوەوە باس لـە بابەتـە ئیمـانی و مرۆیـیـەکان دەکـران و هەوڵی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوایی دەدرا. هەر ئەم وتە جوانانـەبوون یارمـەتییان دام خـۆم بدۆزمـەوە و ڕوو وەرگێـڕم بـەرەو دنیـای نـاوەوەم و سەرلەنوێ هەست بە مرۆڤبوون و بەندەبوونی خۆم بکەم.

شـەوێکیان ئۆزلـەم خـان لەگـەڵ خۆیـدا بردمـی بـۆ قوتابخانەیـەك. لـە سالۆنێکدا کچانی پاك و بێگەرد کۆبووبوونـەوە. کاتێـك ئـەوانم بـەو هـەموو جوانییەوە بینی لە شەرمدا توامەوە.

## وەڵامێکی نایاب:

ئۆزلەم خان تـەفسیری قورئانی گرت بەدەستیەوە. کچێك کە تازە بوو و وەکـو مـن ئاشـنا نـەبوو بـە ئـەرك و بەندایەتییـەکان، پرسـیارێکی بـەم شێوەیەی کرد:

" ئیسلام داوای نوێژکردن دەکـات. هـۆی ئەمـە چییە؟ گـەر نەیکـەین زیان لە کـێ دەکـەوێت؟ بۆچـی هەمیشـە لەسـەر نوێـژکردن دەوەسـتێت و دووپاتی دەکاتەوە؟ "

ئۆزلەم خان کتێبێکی بەردەستی کردەوە. هـەم دەیخوێنـدەوە و هـەم ڕوونیشـــی دەکـــردەوە:" جارێکیـــان فەرمانڕەوایـــەکی گـــەورە دوو خزمەتگوزاری خۆی بۆ باخچەیەکی تایبەتی جـوان و دڵـڕفێن نـارد کـە دوو

مانگ ڕێ دوور بوو، یەکی بیست و چوار لیرەی زێڕیشی دانێ تاکو پێی بگەنە مەزراکە و لەوێ نیشتەجێ ببن و، پێی وتن:

( بلیت و پێداویستییەکانی گەشتەکەتان و پێویستییەکانی ناومالّ و نیشتەجێبوونتان، بەم پارەیە بکڕن.. دوای ڕۆژە ڕێیەکیش دەگەنە ئیستگەیەك کە هەموو هۆکارەکانی گواستنەوەی تێدایە لە ئوتومبێل و، فڕۆکە و ، شەمەندەفەر و ، پاپۆڕ.. نرخی سواربوونی هەرکام لەمانەش لەوی تر جیایە و بەپێی سەرمایەی ئەو کەسەیە کە سواری دەبێت ).

ئەوانیش دوای وەرگرتنی ئەم دەرس و ئامۆژگارییانە، کەوتنە ڕێ. یەکێکیان لەبەر ئەوەی مرۆڤێکی بەختەوەر و شادمان و ژیر بوو، بڕێك لە پارەکەی –بە جۆرێك فەرمانڕەوا پێی ڕازی بێت– خستە کار و کەسابەتەوە تا گەیشتە ئیستگەکە و، سوود و قازانجێکی زۆری لێ دەست کەوت بە چەشنێك کە سەرمایەکەی یەك بۆ هەزار زیادی کرد. بەلاّم ئەوی تریان لەبەر ئەوەی هەرزە و بەدبەخت بوو، تا گەیشتە هەمان جێ، بیست و سێ لیرەی بە قومار و هەلّەخەرجی بە زایە دا و تەنها یەکێکی پێ مایەوە!

لەبەر ئەوە هاوڕێکەی پێی وت:

– کاکی خۆم! ئەم لیرەیەی ئێستا پێت ماوە بلیتی سەفەری پێ بکڕە و بە خۆڕایی لە دەستی مەدە، بۆ ئەوەی لەم ڕێگا دوور و درێژەدا بە برسیتی و ئاوارەیی نەمێنیتەوە. فەرمانڕەوای گەورەشمان تابلّێی لێبووردە و جوانمەردە، بەلّکو لە کەموکوڕییەکانت خۆش ببێت و تۆش سواری فڕۆکە بکات و پێکەوە لە ماوەی ڕۆژێکدا بگەینە نیشتەجێی خۆمان. خۆ ئەگەر بە گوێیشم نەکەیت، ئەوا ناچاردەبیت کە بە پێ بکەویتە ڕێ و بە دوو مانگی ڕەبەق و بە برسێتی و نامۆیی و تەنیایی ئنجا بیبڕیت و بگەیتە جێ.

جا ئەگەر ئەم هاوڕێیە سەرپێچی نواند و، بەو تاکە لیرەیەی پێی ماوە بلیتەکەی نەکڕی -کە وەك کلیلی دەرگای گەنجینەیەك وایە- بەڵکو لە پێناوی حەز و چێژێکی سەرپێیی دا بەکاری هێنا، ئایا تەمبەڵترین مرۆڤیش تێناگات کە ئەو کەسە چەندە بەدبەخت و زەرەرمەند و گێژ و گەلحۆیە؟ئەی ئەو کەسەی نوێژ ناکات! هەروەها ئەی نەفسی خۆیشم کە حەزت لە نوێژ نیە و پێت ناخۆشە!

مەبەست لەو فەرمانڕەوایە: خوای پەروەردگار و بەدیهێنەرمانە..دوو خزمەتگوزارەکەش: یەکێکیان ئەو کەسەیە کە ڕێی ئایینی گرتووەتە بەر و، زۆر بەپەرۆشی و تاسەوە نوێژەکانی دەکات.. مەبەست لەوی تریشیان ئەو مرۆڤە بێئاگایانەیە کە وازیان لە نوێژکردن هێناوە..

بیست و چوار لیرەکەش، بریتی یە لەو بیست و چوار سەعاتەی شەو و ڕۆژ کە تەمەنی مرۆڤیان لێ پێکدێت..

باخچە تایبەتی و جوانەکەش بریتییە لە بەهەشتی بەرین..

مەبەست لەو ئیستگەیەش گۆڕی مرۆڤە، کە لێیەوە دەڕوات بۆ جیهانێکی تر..

گەشت و سەفەرەکەش، ئەو گەشتەیە کە مرۆڤ لە سەرەتای لەدایك بوونیەوە دەستی پێدەکات و بە دەرگای گۆڕدا تێدەپەڕێت تا دەگاتە ئەودنیای هەمیشەیی و ئنجا لەوێ کۆتایی بە گەشتەکەی دەهێنێت.

ئەوانەش بەم ڕێیەدا گوزەر دەکەن بەش بەشن، هەر بەشەی بە پێی پایەی کردەوەکانی خۆی پلەی بۆ دانراوە، هەندێك لەو خواپەرستانە وەك هەورە بروسکە ماوەی هەزار ساڵ بە یەك ڕۆژ دەبڕن و، هەندێکی تریان -وەك خەیاڵ- لە یەك ڕۆژدا ماوەی پەنجا هەزار ساڵ دەبڕن، وەك قورئانی پیرۆز لە دوو ئایەتدا پەنجەی بۆ ئەم ڕاستییە ڕاکێشاوە..مەبەست لەو بلیتەش، نوێژە..

لە ڕاستیدا تەنها یەك سەعات لەو بیست و چوار سەعاتە سەروزیادە بۆ نوێژ و دەستنوێژی ماوەی ئەو شەو و ڕۆژە.

ئایا ئەو کەسەی کە بیست و سێ سەعاتی شەو و ڕۆژ بۆ ئەم دنیا زۆر کورت و کەمخایەنە سەرف دەکات و تاکە سەعاتێکیشی بۆ ژیانی نەبڕاوەی هەمیشەیی تەرخان ناکات، چەندە ستەم لە خۆی و کارێکی دوور لە ژیری دەکات؟!

بەڵێ، ئەگەر خەرجکردنی نیوەی سامان لە قومارێکی وەك " یانسیب " دا، کە هەزار کەس بەشداریی تێدا دەکەن، بە لای هەندێکەوە بە کارێکی ژیرانە بژمێررێ، کە ڕێژە و گریمانی بردنەوەشی یەك لە هەزارە، ئەی ئەو کەسەی کە یەك لە بیست و چواری سامانی خۆی لە قازانجێکی گومان لێنەکراودا و لە دەستکەوتنی گەنجینەیەکی هەمیشەیی دا بەشدار ناکات - کە ڕێژەی قازانجی لە سەدا نەوەد و نۆیە - کارەکەی پێچەوانەی ژیری و دژی دانایی نیە؟ ئایا هەر کەسێك خۆی بە ژیر و تێگەیشتوو بزانێت لەمە تێناگات؟؟

لە هەمان کاتیشدا نوێژکردن، خۆی لە خۆیدا، حەسانەوەیەکی تابڵێی گەورە بە " گیان " و " دڵ " و " ژیری مرۆڤ دەبەخشێت، جگە لەوەش کارێکی قورس و مایەی بێزاریش نیە بۆ " جەستە " ی مرۆڤ. سەرەڕای هەموو ئەمانەش، ئەو کەسەی نوێژەکانی بەجێدەهێنێت، بە هۆی نیازی پاك و خاوێنەوە، هەموو کار و کۆششێکی حەلاڵی تری بۆ دەبێت بە پەرستش و، بە عیبادەت بۆی دەنووسرێت. بەم چەشنە مرۆڤی نوێژکەر دەتوانێت هەموو سەرمایەی تەمەنی بەرەو ئاخیرەت بەڕێ بکات و، بە

تەمەنـە کـورت و فانییەکـەی دنیـای، تەمـەنێکی هەمیشـەیی لـە دواڕۆژدا بەدەست بهێنێت.[1]

" ئـەو شـتەی وا لـە مـرۆڤ دەکـات وا گومـان ببـات کـە نوێـژ هـەرگیز تەواونابێت، وەهمی ئەبەدییەتە. واتە لای وایـە کـە بۆ هەمیشـە لـە دنیـادا دەمێنێتەوە. ئـەو کەسـەی گـوێ لـە نـەفس و شـەیتان دەگرێـت بـیر لـەوە دەکاتەوە کە دوای نوێژی بەیانی نوێژی نیوەڕۆ دێت و پاشان عەسر..هتد. ئیتر بەم جۆرە بێزاری دەردەبڕێت و تەمبەڵی دەنوێنێت. گوایە دڵنیایـە تـا ئـەو کاتـە دەمێنێت.بـەڵێ، هـەموو مردنێـك لـە نێـوان دوو نوێژدایـە. هـەر نوێژێك دەکرێـت کۆتـا نوێـژی مـرۆڤ بێـت. بۆیـە پێویسـتە هـەموو کەسـێك نوێژەکانی بەجۆرێك بکات کە لای وابێت ئەوە دواین نوێـژە و هـەوڵ بـدات بـۆ ویـژدانێکی سوپاسـگوزار و نێوچـاوانی سـوجدەبەر کۆچـی دوایـی نەکات." [2]

زۆر ڕاسـتە.. ڕوونکردنەوەیـەکی زۆر جـوان بـوو. نوێـژ یەکێکـە لـە سـەرەکیترین کارەکـان لای مرۆڤـی موسـوڵمان. لـە هەمبـەر ئـەو هـەموو نیعمەتانـەوە کـە پێمـان بەخشـراوە، لـە ڕێـی نوێـژەوە سوپاسـگوزاریی دەرنەبڕین؟ ئەگەر نەیکەین نانکوێر و سپڵە نابین؟

ڕاستە، بەڵام بۆچی تا ئێستا بیرم لەمانە نەکردبووەوە. بۆچی ئەم خاڵە ورد و گرنگانە نەهاتبوون بە خەیاڵمدا؟ دۆسـتانی سـاختە و گونـاهی زۆر و حەزی ناوبانگ و شۆرەت نەیان هێشت. کەسێك نەبوو هـەڵگری ئـەم ڕۆح و حەقیقەتە بێت لە چواردەورمدا.

---

١- سەرجەمی پەیامەکانی نوور، وتەکان (لا ١٧- ١٩). لە نووسـینی زانـای پایەبـەرزی کـورد مامۆسـتا سـەعیدی نوورسـی. دەقـی کـوردی ئـەم پارچـەیە لـە وەرگێڕانەکـەی مامۆستا فارووق ڕەسووڵ یەحیاوە وەرگیراوە.

٢- سەرجەمی پەیامەکانی نوور، وتەکان، وتەی بیست و یەکەم.

شـەو دوای ئـەو کۆبوونـەوە جـوان و وتـە پیرۆزانـە چـوومەوە بـۆ ژوورەکـەم. پێویسـت بـوو لـە شـوێنێکەوە دەسـت پێبکـەم. مـن بەنـدەی خوایـەکی میهرەبـانم و داوای تۆبـەم لـێ دەکـات، دەیـەوێت لـە هەڵـەکانم تێبگەم و داوای لێبوردن بکەم. چاوەڕێی کرداری باشـە لێم تـا قـەرەبووی ڕابردووی ناشیرینم بکەمەوە.

بەڵێ، دەبێت دەسـت پێبکـەم. لـەو کاتـەدا دەتـوت دەسـتێکی نادیـار قۆڵم دەگرێت و پێم دەڵێت:

– هەستە، لەوانەیە سبەی دوایین ڕۆژت بێت. لەوانەیە هەر نوێژێك کـە دەیکەیت کۆتـا نوێـژت بێـت. دەسـت پێبکـە تـا خـوای گـەورەش ڕەحمـت پێبکات.

هەستام و بڕیاری خۆمم دا. دەتوت باری شانم لەپڕێکدا سـووک بـووە. دڵم پڕبوو لە شادییەکی بێ وێنە..

# بەشی هەشتەم

## بڕیاری خۆم دا



سەرەتا خۆمم شت و دەستنوێژم گرت. پاشان ئەو بەرماڵ و سەرپۆشەم دەرهێنا کە ئۆزلەم خان بە دیاری پێی دابووم. بەرماڵەکەم ڕاخست. زۆر لێی وردبوومەوە. دەبێت ئیتر ئەوێ ببێت بە بەرزترین و بەنرخترین پایەی من. پێویستە ڕاز و نهێنییەکانم لەوێدا هەڵبڕێژم و لە قووڵایی دڵمەوە دان بنێم بە تاوانەکانمدا و داوای لێخۆشبوون بکەم. ئنجا ڕۆیشتمە بەر ئاوێنە بچووکەکەی ژوورەکەم. بۆ یەکەم جار خۆم داپۆشی.

منێک کە ساڵانێك بە خانمانی داپۆشراو پێدەکەنیم و جاروباریش گاڵتەم پێدەکردن، هەنووکە بە حەز و شەوقێکی بێسنوورەوە خۆمم دادەپۆشی. ئەوەندە ناخم پڕبوو بێ ویستی خۆم فرمێسك لە چاوم سەری دەردەکرد.

دەتوت ئەوەی بە سەرمەوەیە تەنها پارچەیەك قوماش نیە، بەڵکو سومبولی من و پارێزەرێکی خوایییە. بەڵێنێکە کە بە خوام داوە، پەیمانێکە کە لە ڕێگەی ئەو لا نەدەم.

پاش خۆداپۆشین جارێکی تر لەدایك بوومەوە. هەستم کرد قوتاربووم لە پیس و چەپەڵی ژیانی کۆنی ڕابردووم و هەنگاوم ناوەتە ژیانێکی نوێوە. تێگەیشتم کە لەچك تەنها پارچەیەك پەڕۆ نیە، بەڵکو نیشانەیەکە بۆ ئەو

خۆشەویستییەی لە دڵمدایە. بەدەم هەنسکەوە بە هەردوو دەستم گرتم: "خوایەگیان! مەهێڵە جارێکی تر ئەم سەرپۆشەم لابچێت. بەمەوە بمگەیەنەوە حزوورت. گەر پێویستی کرد بیکە بە پارچەیەك لە کفنەکەم. بیکە بە شایەت بەسەرمەوە. ئیتر ئەو نزیکترین هاوڕێمە. ئەو بەڵگە و ئیمانی منە. "

لە بەرماڵەکەم نزیك بوومەوە. هێندە خرۆشابووم و جۆشابووم گوێم لە لێدانی دڵی خۆم بوو، هەستم بە ئاگری دەروونم دەکرد لە ڕوخسار و دەستەکانمدا.

پاش ئەو هەموو ساڵە لە حزووری خوای خۆمدا بووم. بۆ یەکەمجارم بوو ئەوەندە نزیك بووبێتمەوە. دەستم هەڵبڕی و پاڕامەوە: " ئەی خوای پەروەردگارم! ئەم هەنگاوەم مەکە بە دوایین.. ئەم نیەتەی سەرەتام بکە بە جاویدانی. ئەم یەکەم نوێژەم لێ قبوڵ بکە. ئەم یەکەم بەندایەتییەم تا مردن درێژ بکەرەوە..."

دەتووت ئەوێ تەنها بەرماڵێك نیە، بەڵکو مەقامێکە خوای گەورە دەمبینێت و هەڵمدەسەنگێنێت. هەستم دەکرد لەیەك کاتدا لەژێر چاوی هەزاران فریشتەدام.

دڵم تەپە تەپ لێی دەدا و دەستە لەرزۆکەکانم بەرزکردەوە..( الله أكبر ).. نوێژم دابەست. ئەم وشەیە وەکو بۆمبێك لە دەروونمدا تەقیەوە و چی پیسی و ناشیرینی هەبوو ڕایماڵی. هێندە دڵم توند لێی دەدا تا قولەپێم بووبوو بە ئارەق.

ئەوە یەکەم نوێژ بوو. هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە...قەت ئەو چێژ و لەزەتە لەیاد ناکەم.نێوچاوانم نایە سەر بەرماڵەکە. خۆم پێنەگیرا و دامە پرمەی گریان. بیرم نایەت چەندە گریام. هەموو بەرماڵەکەم تەڕبووبوو. دڵم ئەوەندە توند لێی دەدا خەریك بوو دەهاتە دەر.

له خوای گەورە پاڕامەوە و داوای لێخۆشبوونم کرد. پەنام بە ئەو گرت و پەیمانم پێدا.

مەگەر وەستان لە دیوانی ئەودا و مل کزکردن لە حزووری ئەودا و سوژدە بردن بۆ پایەی بڵندی ئەو چ ئارامی و ئاسوودەییەکی بێ وێنەیە! کەواتە بە هەڵە لە شوێنانی تر بەدوای کەیف و سەفادا گەڕاوم و لە دەرگای هەڵەم داوە.

بە چەند کاتژمێرێك نوێژەکەم تەواوکرد، کە حەزم نەدەکرد قەت تەواوببێت. بەڵام منیش لەگەڵیدا تەواوبووم. ئەمە تاکە مەڵهەمی شیفابەخش بوو بۆ دڵی زامدار و خەستەم. وەك بڵێی لە نوێژەکەدا هەزاران نەشتەگەر دڵم لەت دەکەن و پیسی و ناشیرینی دەردەهێنن. بۆیە نەمتوانی سەر بەرماڵەکەم جێبهێڵم.

## کچە شەهیدەکە:

لە کاتێکدا هەستەکانم تەواو ماندوویان کردبووم و دڵم لێوان لێو بوو لە ئاسوودەیی، لەناکاو دەرگای ژوورەکەم کرایەوە!

وامزانی ئۆزلەم خانە و ئاوڕم دایەوە. باوەڕم بە چاوی خۆم نەکرد. وامزانی خەیاڵ دەبینم. نەخێر، کچە شەهیدە جوانەکە لە بەرامبەرمدا ڕاوەستابوو. وەستان و ڕوانینی هێندە کاریگەر بوو، مەحاڵ بوو مرۆڤ حەیرانی نەبێت. نووری ڕوخساری ئاوی چاوی دەبرد و خەندەی لێوی دڵی مرۆڤی گەرم دەکردەوە. هێزێکی نادیار منی بۆ لای ئەو کێش دەکرد و مەستی دەکردم.

بە دەنگی ناسك و شیرین وتی:

– هاتووم پیرۆزبایبیت لێ بکەم دادە نیلۆفەر! ئەمێستا هەموومان چەپڵەت بۆ لێ دەدەین و دوعای خێرت بۆ دەکەین. واز لە ئۆزلەم خان

مەهێنە. ئەو لوتفی خوایە بۆ تۆ. لەبیرت نەچێت هەمیشە من لەگەڵت دەبم. جارجار دێم بۆ لات. ڕۆژانی جوان چاوەڕێتن. دەی خوا ئاگادارت بێت.

ڕۆیشت.

لە جێی خۆمدا قەتیس مام. نەشمدەتوانی هێز بدەمە خۆم و هەستمە سەرپێ. پێش ئەوەی ببووریێمەوە وتم: " خوایەگیان وام لێ بکە شایانی تۆبم." لەسەر بەرماڵەکەم بووړابوومەوە. کە بەئاگا هاتمەوە بانگی بەیانی دەدرا. بەیانی زوو چووم بۆ لای ئۆزلەم خان و ویستم ڕووداوەکەی دوێنێ شەوی بۆ بگێڕمەوە. کە بە داپۆشراوی بینیمی باوەشی پێدا کردم وتی: یاخوا پیرۆزت بێت، زۆرت لێ جوانە! ئێستا ئیتر بوویت بە شاجوان! شاجوانییەکەی پێشووت کاتی و دروستکراوبوو. ئەمەی ئێستات ڕاستەقینە و پاك و بێگەردە.

– دوێنێ شەو کاتێك نوێژم دەکرد کچە شەهیدەکە هات بۆ لام!

– دەزانم.

بە سەرسامی پرسیم:

– چۆن دەزانیت؟

– شەهید نامرێت. شەهیدان لە هەموو خزمەتێکی خێردان. گەر یارمەتی و هیممەتی ئەوان نەبووایە ئێمە دەمانتوانی ئەو هەموو خزمەتە بەئەنجام بگەیەنین؟

– واتە تۆش دەیناسیت؟

وەڵامی نەدامەوە.

## بەرەو ژیانێکی نوێ؛

کۆتایی هەفتە بوو.

دادە ئۆزلەم پێی وتم: " ئەمڕۆ دەچین بۆ شوێنێکی تایبەتی. دڵنیام جیهانێکی تازە دەبێت بۆ تۆ. "

پێکەوە ڕۆیشتین.

داپۆشراویی و دەستنوێژ هێندە هێزی پێدەدام دەتووت سوپایەك لە دوامەوەیە و پارێزگاریم دەکەن. بیرم لە حاڵی پێشووم کردەوە، کە بە ڕێدا دەڕۆیشتم یەکێك سەیری دەکردم و یەکێك تانەی ناشیرینی لێ دەدام و یەکێکی تر لە هەوڵی ئەوەدابوو دەستم بۆ بهێنێت. بەڵام ئێستا ئەوانەی بە لامدا تێدەپەڕین سەریان دادەخست. کەواتە سەرپۆش پارێزەری حەیا و حورمەتیشە. جددیەت و دامەزراوی دەبەخشێت. چاوم پڕبوو لە فرمێسك. لەبەر خۆمەوە وتم: " خوایەگیان. توخوا بمکە بە شایانی ئەم جلوبەرگە.." خانم دکتۆر دیاربوو لە هەستەکانم تێگەیشتووە. دەستی هێنا بە پشتمدا و، وتی:

– خوای گەورە چاوێکی خۆشدەوێت لەبەر ئەو فرمێسك بڕێژێت.

زۆر بەپێ ڕۆیشتین. پاشان لە گەڕەکێکدا هاتینە بەردەم بینایەکی ڕێکوپێك کە باخچەیەکی جوان لەبەردەمیدا هەبوو. ئۆزلەم خان وتی:

– ئەمە بینای خزمەتی ئیمەیە. ئەو خانمانەی لێرە دەمێننەوە وانە دەڵێنەوە بەو خوێندکارە کچانەی سەردانیان دەکەن و خزمەتی ئیمان و قورئان دەکەن. بەکورتی ئێرە لەپێناو ڕەزامەندی خوادا کراوەتەوە.

چووینە ژوورەوە. هەر لە دەرگای دەرەوە جوانی و پاکوتەمیزی و ڕێکوپێکی سەرسامیان کردم. هەر بە دیتنی شوێنەکە دەچووە دڵەوە. بیری ئەو ڕۆژانەم کەوتەوە کە لە ئوتێلە ڕاقییەکاندا پێشوازیم لێ دەکرا. هەوای خنکێنەر و ئابڵۆقەدەری ئەوێ تەنگەنەفەس و بێزاری دەکردم.

کەچی هەوای ئێرە دڵنیایی و شیرینی و فەرەحی دەبەخشی بە مرۆڤ. ئۆزلەم خان بیناکەی پیێ دەناساندم:

– قاتی یەکەم چێشتخانەیە. قاتی دووەم شوێنی وانەی خوێندکارانی ناوەندی و دواناوەندییە. لە قاتی سەرووتردا خوێندکارانی زانکۆ دەمێننەوە. سەروو ئەویش سالۆنە و تێیدا هەفتانە وانەی ئیمانی بە خانمان دەوترێتەوە. دوو قاتی هەرە سەرەوەش بەشی ناوخۆیی خوێندکارانە. ئەو خانمانەی لێرە خۆبەخشانە کاردەکەن هەوڵ بۆ پەروەردەکردنی کچانی لاو دەدەن و، لە خراپە دەیانپارێزن و، ئیمان و باوەڕیان پێدەناسێنن و، دەیانکەن بە چەند گەنجێکی بەسوود بۆ خاک و نیشتمان.

خانم دکتۆر هەم دەیگەڕاندم و هەم شوێنەکانیشی پیێ دەناساندم.خوایە گیان ئەوانەی ئەویێ چەند مندالانی شیرین و، کچانی نوورانی و، خانمانی ڕووخۆش و خوێنگەرم بوون! ئەمانە لە کوێوە هاتوون؟ کەسانی واش هەن لە کۆمەڵگەدا؟ زۆر سەرم سووڕما زۆر...چوومە ئەو قاتەی خوێندکارانی زانکۆ تێیدا دەمانەوە. کچان بووبوونە حەلقەیەکی گەورە. خەریکی خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور بوون.

## حەیرانی بریسکەی بیستوچوارەم بووم:

دانیشتین. بابەتەکامان بریسکەی بیستوچوارەم[1] بوو کە باس لە پۆشتەیی ئافرەتان دەکات. باسێکی ناوازە و بەنرخە سەبارەت بە لایەنی دەروونناسی و کۆمەڵناسی پۆشتەیی خانمان.

---

١– بریسکەی بیستوچوارەم لە کتێبی بریسکەکان کە بەرگی سێیەمی سەرجەمی پەیامەکانی نوورە و لە دانراوەکانی زانای گەورەی کورد سەعیدی نوورسی‌یە. مامۆستا فارووق ڕەسووڵ یەحیا کردوویەتی بە کوردی (وەرگێڕ)

بابەتەکەم زۆر بەدڵ بوو. بەداخـەوە کـە ئێمـە تـا ئێستا ئاگامـان لـەو حەقیقەتە مەزنانە نییە. ئاگامان لەم باسە نوورانییانـە نیـە کـە دڵ ڕوونـاك دەکەنەوە و خۆراکی ڕۆحن.

لە ناوەڕاستی خوێندنەوەکەدا نۆزلەم خان ڕووی کردە کچەکان و وتی:

– سەیرکەن کچینە کێم بۆ هێناون.

هەموو سـەرنجەکان هاتنـە سـەر مـن. منێـك کـە پێشـتر حـەزم دەکـرد چەپڵەم بۆ لێ بدرێت و ستایشم بکرێت و بکرێمە تاجی سەر، لەپڕێکدا دڵـم بەپەلە کەوتە لێدان. من کەی ئەوەندە بەنرخ بووم و شایانی ئەوەبووم بەو فریشتانە بناسێنرێم و ڕێزم لێ بگیرێت؟ نۆزلەم خان وتی:

– کچـینە، ئـەم خوشـکەتان نـاوی نیلۆفـەرە. واتـە نیلۆفـەر خانـە بەناوبانگەکە!

لەپڕێکدا سالۆنەکە پڕبوو لە دەنگی " ئاااای، ئـۆووو، هـاااا ". لەگـەڵ کچەکاندا یەك بە یەك تەوقەم کرد و باوەشیان پێدا کردم. لەدڵەوە " ئامین " م بۆ دوعا پاکەکانیان کرد. لە دڵی خۆمدا وتم: " توخوا خوایە گیان! با ئێرە دوایین جێگەم بێت. من لەمانە دامەبڕە."

چووینە قاتی خانمان. لەو کاتەدا گروپێك لە ژنان قورئانیـان دەخوێنـد و دەستەیەکی تر فیقە فێردەبوون. ئەمانەی ئێرە هەموویان خێزانداربوون، بەڵام لە خەمی خزمەتی ئیمان و قورئاندا بوون. بڵێـی لێـرە جێیـەکیش بـە مـن بـدەن؟ ئایـا خـوای گـەورە لـوتفێکی هێنـدە گـەورەی پـێ ڕەوا دەبینیم؟نۆزلەم خان ناساندمی بە بەڕێوەبەری بیناکە. نـاوی مەلـەك خـان بوو. هەر وەك ناوەکەی فریشتەبوو. باسی ئـەو خزمەتانـەی بـۆ کـردین کـە ئەنجامیان دەدا.

ئیرەییم دەبرد:

ماشەڵڵا! هەزار ماشەڵڵا! ئافرەتانی فیداکار و قارەمان شەو و ڕۆژیان خستبووە سەر یەك تا کچانی لاو تووشی تاوان نەبن و دین و ئیمانیان نەدۆڕێنن و بەسوودبن بۆ خاك و وڵات. مەگەر کارێکی تر هەیە لەمە گرنگتر و پێویستتر؟ ئەگەر ئێمەومانانیش لە ساڵانی خوێندنماندا ئەم خزمەتە جوانانەمان ڕێ بهاتایە، تووشی ئەو هەموو دەردەسەری و ناشیرینییە نەدەبووین. چەندەها خانم و کچی لاو وازیان لە ژیانی تایبەتی خۆیان هێناوە ڕوویان لەم خانەی خزمەت و زانست و عیرفانانە کردووە. یەکێك بەرپرسە لە پاکوخاوێنی و یەکێك قاپەکان دەشوات و یەکێك چا لێدەنێت و یەکێکی تریش وانە دەڵێتەوە. یەکێکی دیش وانەی ئیمان و قورئان بە هاوڕێیەکی دەڵێتەوە کە تازە هێناویێتی. ئیرەییم پێیان هات. خۆم پێ نەگیرا و بە مەلەك خانم وت:

– توخوا لێرە شوێنێکیش بدەن بە من. لێرە قبوڵم بکەن. ئەرزەکەتان بۆ دەسڕمەوە و قاپەکان دەشۆم. بەس ئەوەندە مەحرومم مەکەن لەم جوانی و پاکی و ڕووناکییە.

مەلەك خان باوەشی پێدا کردم و ماچی کردم. دڵی دامەوە. وتی:

– ئەوە کەی قسەیە نیلۆفەر خان! ئێرە بۆ خزمەتگوزاری و ڕەزامەندی خودا کراوەتەوە. لێرە جێی هەموو کەسێك هەیە. لێرە کەس خزمەتکار نیە. هەموو کەسێك ئەهلی خزمەتە. لێرەدا ئاغا و خزمەتکار، گەورە و بچووك نیە. هەموومان خوشکی یەکین، ئیشەڵڵا لە دوارۆژیشدا هەر وا دەبین. هەر کەسە و بەپێی توانا و لێهاتنی کارێکی پێدەدرێت. هەموومان هەوڵ دەدەین ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست بهێنین. بەلای ئێمەوە قاپ شتن و وانە وتنەوە وەکو یەك خزمەتە. گرنگ ئەوەیە خوای گەورە قبوڵی بکات. لە قاتی خانماندا ژوورێکت دەدەینێ. ئیشەڵڵا لە

کورتترین کاتدا خۆت پێدەگەیەنیت. دواتر دەبیتە خوشکی گەورەی کچان. نموونەیەکی جوان و بەرجەستەیت بۆ ئەوەی نەکەونە گوناهەوە و ڕێی ڕاست هەڵە نەکەن. بەو جۆرە ناوبانگ و جوانییەکەت لە خزمەتدا بەکاردەبەیت. ئەوانەی حەزدەکەن بتبینن و بتناسن، کاتێك بە داپۆشراوی دەتبینن دەبیتە ڕێنیشاندەرێکی باش بۆیان.

## لە خۆشیان وەختەبوو بفڕم:

مەلەك خان هەموو دنیای دا بە من. لەخۆشیدا دەفڕیم. هیچ مژدەیەك هێندەی ئەمە دڵخۆشی نەدەکردم. خوای گەورە هەزار جار لە ئۆزلەم خان ڕازی بێت چونکە ئەو تکای کردبوو کە ئەو مژدەیەم پێبدەن. دواتر پێی وتم:

– ئیتر ڕێی خزمەت کردن بۆ تۆش کراوەتەوە. کاری سکرتێریی کلینیکەکەت تەواوبوو. لە ئێستاوە تۆ لێرە دەبیت و هەوڵی فێربوونی قورئان و زانست دەدەیت، ئێمەش دێین و سوودی مەعنەویت لێ وەردەگرین.

خوای گەورە هەموو دەرگاکانی بۆ کردمەوە. هەم دەرگای ڕەحمەتی خۆی و هەم دەرگای دڵی مرۆڤەکان. لەو لانەی بەهەشتە نیشتەجێبووم.

شەوانم لەسەر بەرماڵ بە نوێژ و پاڕانەوە بەسەردەبرد. فرمێسکی زۆرم دەڕشت چونکە گوناهەکانم زۆربوون. خانمێك ڕۆژانە قورئان و فیقهی پێدەوتمەوە. ڕۆژانە بە لایەنی کەمەوە ١٠٠ لاپەڕەم لە پەیامەکانی نوور دەخوێندەوە.

نەمدەویست یەك چرکەم بەخۆڕایی بڕوات. کاتی بەتاڵم هەبووایە نوێژەکانی پێشووم بە قەزا دەگێڕایەوە. نازانم ڕۆژ و مانگ چۆن تێپەڕی.

تەنها شتێك كە دەمزانی ئەوەبوو خوای گەورە خەزێنەیەكی نەبڕاوەی پێشكەش كردبووم.

تێر نەدەبووم لە قورئان خوێندنەوە.. تێر نەدەبووم لە خوێندنەوەی پەیامەكانی نوور.. تێر نەدەبووم لە جوانی و ناسكی بەندایەتی بۆ خوا.. تێر نەدەبووم لە هەڵمژینی هەوای ئازادی و سەربەستی ڕاستەقینە..

تومەز من زۆر برسی و نەزان بووم...

ساڵێكی ڕێك تێپەڕیبوو بەسەر ژیانم لەو بەهەشتەدا. ئارامی و ئاسوودەییەكی بێ وێنە لە دڵمدا سەریان هەڵدابوو. هەموو ڕۆژێك بوونم لەگەڵ ئەو خانمە پاكانەدا و هەست كردن بە جوانییەكانی ئیمان لە تەكیاندا، بەختەوەرییەكی بێ سنووربوو.

## دۆستێك:

لە ژوورەكەمدا كتێبم دەخوێندەوە. یەكێك لە دەرگای دا.

مەلەك خان:

– دەتوانم بێمە ژوورەوە نیلۆفەر گیان؟

خێرا هەستامە سەرپێ و، وتم:

– فەرموون مامۆستا.

لەپڕ چاوم بە نوورای كەوت. ئای خوایە گیان!

باوەشم پێدا كرد. چۆن هاتووە بۆ ئێرە؟ بۆنم پێوە كرد و ماچم كرد. لە خۆشیدا دڵم تەپە تەپ لێی دەدا و قوڵپی هەنسك گەروومی گرتبوو. بیرم نایەتەوە چەندێك بە پێوە گریام. چەند كاتژمێرێك نەهاتمەوە سەر خۆم. ئەمانە فرمێسكی شادی و سوپاسگوزاری بوون.

لەگەڵ نوورای بەرامبەری یەك دانیشتین. كەوتینە باس و خەیاڵی ساڵانی ڕابردوو. ئەوەندە شت هەبوو بۆ باس كردن و وتن و بیستن..

نوورای وتی:

– کاتێك بیستم تۆ لێرەیت زۆر زۆرم پێخۆشبوو. ئێمە ئەم حەقیقەت و خزمەتانە لە سەیداوە فێربووین، خوا لێی ڕازی بێت..

هەرکە ناوی سەیدای هێنا بروسکەیەك بە مێشکمدا تێپەڕی. سەیدا! ئەو مرۆڤە پڕ نهێنییەی کە هەرگیز دەستم پێی ناگات. نوورای وتی:

– دەزانیت، من دوو ساڵە لێرە کار دەکەم. لەگەڵ ئۆزلەم خاندام. ژوورەکەم بە تەنیشتی ژوورەکەی ئۆزلەم خانەوەیە. بەڵام تێناگەم چۆن تا ئێستا من تۆم نەدیوە. ئەمە لە کاتێکدا تاکە دکتۆری دەروونیی نەخۆشخانەی ئێرە منم و نەخۆشێکی زۆر ڕێی تێم دەکەوێت. خۆت بگرە، مژدەیەکی خۆش ماوە پێتی بڵێم.

دڵم بەپەلە کەوتە لێدان. دڵم ئەوەندە بریندار و هەستیار بوو هەموو شتێك کاری لێ دەکرد، هەموو ڕووداوێك تووشی داخورپانی دەکرد. وتم:

– خێرە ئیشەڵڵا..

– سەیداش لێرەیە.

لەناکاو هەموو گیانم نیشتە سەر ئاو و لەرز دایگرتم. نوورای وتی:

– بوەستە کچێ، ئەوە بۆ وات لێ هات؟ ئەمە هەواڵێکی خراپ نیە. سەیدا دوعای زۆری بۆ کردیت. دوو ڕۆژ لەمەوپێش سەیدا هات بۆ ئەم شارە. لێرە تەعین کراوە. ئەویش لە خەستەخانە کاردەکات. لە بەشی ناوخۆیی پیاوان دەمێنێتەوە.

نوورای دەیزانی چ هەستێکم بۆ سەیدا هەیە، بەڵام بۆ ئەوەی دڵی من شتێك نەکات دەری نەدەبڕی. وتی:

– حەز دەکەم ئێوارەیەك هەردووکتان دەعوەتیماڵی ئێمە بن، لەوێ یەکتر دەبینن. چونکە ئەویش ئاگای لەم خۆداپۆشین و گەڕانەوەیەتە و زۆری پێ خۆش بووە.

بێ بیرکردنەوە وتم:

– بەڵێ دەبێت.. کەی؟

– سبەینێ.

## بۆ بینینی سەیدا خەریك بوو دڵم دەوەستا:

سبەی دێت؟ دەتووت چرکەکان و خولەکەکان بوون بە ساڵێکی دوور و درێژ. پەلەپەلی ئەوەندەی تر دڵمی دەگوشی و ئارامیی لا هەڵدەگرتم.

ئەو ئێوارەیە بۆ من زۆر تایبەت بوو. بینینەوەی سەیدا و، پاشان لەوانەیە هەلی ئەوەم هەبێت دڵی خۆمی لا بکەمەوە – هەرچەند گریمانەیەکی زۆر بچووکە – و ڕازی بێت بچمە ژیانیەوە! ئای چەند جوان دەبوو!

دەمتوانی ئەمە بکەم؟ نەمدەزانی، وەلێ دڵنیابووم خۆشەویستیم بۆ سەیدا زۆر قووڵ ڕەگی داکوتیوە و قوڵپی ئەوینم دانامرکێتەوە. سەیدا بۆ من لە ئاستێکدا بوو کە دەست نەیدەگەیشتێ. تەنانەت نزیکبوون لێی تووشی دڵەتەپێی دەکردم.

لە ماڵی نوورای یەکترمان بینی. کاتێك چاوم کەوتە سەر چاوی سەیدا سڵەمیمەوە. ئەو وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی بە ئەدەبەوە سەری داخست. وتی:

– بەخێربێیت نیلۆفەر. هەواڵی گەڕانەوەت دڵخۆشی کردین. کە بیستم سوجدەی سوپاسگوزاریم برد.

بیری لە من دەکردەوە. ئەویش نەیدەتوانی من لەبیر بکات، ئەوە ڕاست بوو، بەڵام ئایا عەشق بوو؟ هەرچۆنێك بێت دڵنیابووم هەستێك لە نێوانماندا هەیە.

ئەو ئێوارەیە من و سەیدا و ئۆزلەم خان دەعوەتی ماڵی نوورای و مێردەکەی بووین. هەموویان کەسانێك بوون کە ژیانیان بۆ خزمەت کردن

تەرخان کردبوو. گشتیان ڕابردوویان پاك بوو. تەنها من لە ناویاندا لە ناشیرینییەوە گلابووم...

هەموو هەست و سۆزم لای نوورای دڕکاندبوو. بڕیار وابوو ئەویش بە سەیدای بڵێت. لەوانەیە سەیدا بڵێت " باشە". ئەوکات من دەبووم بە بەختەوەرترین مرۆڤی سەر زەوی و گوێڕایەڵترین هاوسەر. ئا بەم جۆش و خرۆشەوە لەماڵی نوورای بووم.

دوای نان و چا خواردن ئۆزلەم خان بیانوویەکی هێنایەوە و ڕۆیشت. وابزانم ئەوانیش ئاگایان لێبوو کە خەریکە چی ڕوودەدات. دڵم هێندە بە خێرایی لێی دەدا هەموو هێزم بەکارهێنابوو نەبووریێمەوە. چرکەساتێکی ئەوەندە ماندووکەر بوو هەموو گیانم نیشتبووە سەر ئاو.

سەیدا بێ ئەوەی سەر بەرز بکاتەوە وتی:

– نیلۆفەر، شتێك هەیە کە پێویستە پێتی بڵێم. پێویستە پێکەوە باسیان بکەین.

لاجانەکانم لە حەیبەتدا پلی دەدا و گوێچکەکانم سوور هەڵگەڕان. گوێم لە تەپەی دڵی لاوازم بوو.

بەردەوام بوو:

– تۆ لە کاتی خوێندکاریتەوە دەناسم. هەر لە سەرەتاشەوە ئاگام لە هەستی تۆ هەبوو بەرامبەرم، بەڵام من هاوسەرگیریم کردووە. خێزانی ڕەحمەتیم باشترین و پاکترین ژنی دنیابوو. منیش ئەوم زۆر زۆر خۆشدەویست. هەموو ڕۆژێك بڵێسەی ئەوینم بۆی پتر پەرەدەسەنێت. دڵنیام ئەویش ئێستا بە حەسرەتەوە چاوەڕێی من دەکات. من ئەوم وەك هاوسەر و هاوڕێی ژیان هەڵبژارد. من تەنها بۆنم بە گوڵێکەوە کرد. دوای ئەوە ئیتر ناتوانم بۆنی گوڵێکی تر بکەم. چونکە پەیمانم داوە تا کۆتایی ژیانم بە یادگارییەکانی ئەوەوە بژیم. تکادەکەم لێم تێبگەیت.. ئەم هەستە

ناتوانرێت باس بکرێت تـەنها مـرۆڤ تێیـدا دەژی. بـەڵام تـۆ و خزمەتـەکانت بەدرێژایی تەمەن یاد دەکەمەوە و دوعات بۆ دەکـەم. چیت پێویسـت بێت ئامادەم بۆت جێبەجێ بکەم، بەڵام وەکو برایەك نەك خۆشەویستت.

چاوەڕێی ئەمەم دەکرد، بـەڵام ئێجگـار ئەوەنـدە ڕوون و ئاشـکرا نـا.. هیچ نەبێت ئومێدم وابوو بڵێت: " بیرێکی لێ دەکەینـەوە، بـا بـزانین چۆن دەبێت، لە داهاتوودا قسەی زیاتری لەسەر دەکەین "

بەردەوام بوو:

– بەڵام کوڕێك دڵـی پێتەوەیـە و قسـەی لەگـەڵ مـن کـردووە. ئەگـەر قبـوڵی بکـەیت بەختـەوەرت دەکـات و پێکـەوە ژیـانێکی پـڕ لـە خزمـەت و ئارامی بەسەردەبەن.

سەرم داخست و لەوە زیاتر نەمتوانی ڕێ لە فرمێسکەکانم بگرم. وتم:

– منیش بەسەر گوڵێکدا بۆنی گوڵێکی تر ناکەم. تەمـەنێك ئـەم حەسـرەتە لەگـەڵ خـۆم هەڵدەگرم. ژیـان بـەم تاسـەیەوە باشـترە لـە شـووکردن بـە یەکێکی تر، مادەم خواگیان وای بە گونجاو زانیوە من ڕازیم. خۆشەویستی خوای پەروەردگارمم بەسە.

بـەدەم گریانـەوە چـوومە دەرەوە. بـە زۆر دانم بـە خۆمـدا گـرت ئـاوڕ نەدەمەوە و بۆ دوایین جار لێی نەڕوانم.

ئـەو ڕۆژە و ئـەمڕۆش.. هـەموو خولـەکێك و هـەموو چـرکەیەك.. لـە ژوورەکەمـدا و لەسـەر بەرماڵەکـەم فرمێسـکی نـەبڕاوە و بڵێسـەی ئـەوین پێشـکەش بـە خۆشەویسـتی خۆشەویسـتان دەکـەم. دەزانم ئـەم دەرگایـە دەرگـای ئومێـدە. دەزانم خـوای مـن ئەوەنـدە میهرەبانـە بەنـدەکانی دەرناکات.

ئیتر بۆ من ئەم ژیانە تەواو. هیچ چاوەڕوانییەکم نییە بمبەستێتەوە بەم ژیانەوە. هەموو تەمەنم تەرخان کردووە بۆ خزمەت و ئامادەسازی ئاخیرەت. هەربۆیە ڕۆژانم لەسەر بەرماڵ بە ئارامی بەسەردەبەم.

ئەوەش باش دەزانم خۆشەویستی من بۆ سەیدا – کە هەرچەند دەکەم ناتوانم لە دڵمی دەربکەم – تەنها لە بەهەشتی خوایی دا دەکرێت کۆتاییەکەی بەیەك شادبوون بێت. بۆیە نائومێد نیم لە خوای خۆم. ئەوەندە خۆم داوەتە دەستی نازانم کەی ڕۆژە و کەی شەو، کێم و چۆن دەژیم.

سەیدا بۆ من هاوسەرگیری و چێژ و ئارەزووی جەستەیی نەبوو. دۆستێك بوو دەستی دەگرتم و بەرەو جیهانی مەعنەوییەت و مەقامە بڵندەکان یارمەتی فڕینمی دەدا. من عاشقی لەش و لاری ئەو نەبووم. بەڵکو دڵم چووبوو بە ڕۆحی جوان و ڕەوشتی بەرزیدا. لەبەر ئەمەبوو حەزم دەکرد تەمەنێك لەگەڵیدابم و هاوسەرێتیی بکەم. ئەم داوایەم لەم دنیایەدا نەهاتە دی. بۆیە پەنا دەگرم بە میهرەبانی و ڕەحمەتی خوای خۆم کە لە بەهەشتدا بەوم شادبکات.

هەموو ساتێك لە چاوەڕوانی ئەوەدام حەزرەتی ئیزرائیل بێت و دەرگام بکاتەوە. بۆیە شەوان تا بەیان بەرماڵەکەم بە فرمێسك تەڕ دەکەم و چاوەڕێی ئەو کاتەم.

هەنوکە بیر دەکەمەوە: خوای گەورە سەرەڕای هەموو گوناه و تاوانەکانم لێم خۆش دەبێت؟

لەم ساتەوەختەشدا کە ئێوە دەڵێن: "ئەم کتێبە بەسەرهاتی منی گێڕاوەتەوە" منیش پێتان دەڵێم لەبەرگی دووەمی ئەم کتێبەدا بە ناونیشانی: **"ئەو ئافرەتەی خۆی دۆزییەوە"** پێتان دەگەمەوە...

## کۆتایی بەرگی یەکەم

# پێڕست

# KENDİNİ ARAYAN KADİN

## HALİT ERTUĞRUL

(ئەو ئافرەتەی لەدووی خۆی دەگەڕێت) یەکێکە لە بەرهەمە ناوازەکانی چیرۆك نووسی بەناوبانگ (خالید ئێرتوغرولّ)، کە هاوئامانجە لەگەڵ بەرهەمە ناودارەکانی وەك (محەمەدی دوزجەیی)، (ئەو پیاوەی لە دووی خۆی دەگەڕێت) و (ئایسێل).

نووسەر لەم چیرۆکەدا ئاسۆیەکی نوێمان نیشان دەدات و تیشك دەخاتە سەر دیمەنگەلێ کە پێشتر دەرکمان پێ نەکردوون.

لەم بەرهەمەدا ئاشنا دەبین بە چیرۆکی ژیانی (نیلۆفەر) و، ئەو ئاستەنگانەی پێیاندا تێپەڕ دەبێت و، ئەو هەڵە و کێشانەی گرفتاریان دەبێت، دواجار نموونەیەکی ناوازە لە هەوڵدان بۆ خۆدۆزینەوە و هەستانەوە و دەستپێکردنەوەی ژیان دەبینین.

لەوانەیە هەموو ئەم بەسەرهاتانە خەمبارمان بکەن و وامان لێ بکەن بیربکەینەوەو هەست بە (نیلۆفەر)ەکانی دەوروبەرمان بکەین، لە کۆتایشدا پەی بەوە ببەین کە یەکێ لە ئەرکە هەرە مەزن و پیرۆزەکانمان دەست گەیشتنمانە بە هاوشێوەکانی (نیلۆفەر).

ISBN 0-0119-0000-8



نرخی (٣٠٠٠) دینارە